د.عبدالكريم بكار

# ڕێڕەوی خێزان

«چەند بنەمایەك بۆ ئاراستەکردنی خێزان»



# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانیان، سەڵات و سەلامی خوا لە دیداری دوایین پێغەمبەر موحەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) و یار و یاوەرانی بە گشتی.

ئەم پەرتووکەی لەبەردەستتدایە بەشی یەکەمە لە زنجیرەی (پەروەردەی دروست)، بەشی دووەمیشم بۆ قسەکردن لەسەر دە بنەمای گرنگ دەربارەی پەروەردەکردنی ڕۆڵەکانمان تەرخانکردووە، سەبارەت بە بەشی سێیەمیش: بۆ قسەکردن دەربارەی گفتوگۆ و لێکتێگەیشتنی خێزانیی تەرخانم کردووە.. پێم باش بوو ئەم بەشە تەرخان بکەم بۆ قسەکردن لەسەر چەند بنەما و چەمکێك کە نەخشەڕێگای خێزانی موسوڵمانمان بۆ دەکێشن و بە چەندین دیدگا و ڕەوشت و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی جوان ئاشنای دەکەن، بۆیە پێم وایە بەرچاوڕوونی مرۆڤ دەربارەی ئاڕاستە و ڕێڕەوی ژیانی یەکێکە لە هەرە گرنگترین خاڵەکانی دامەزراوی و بەختەوەری ژیانی خێزانداری، هەروەها گرنگیی تایبەتی هەیە لە دەستنیشانکردنی ئەو شێواز و ڕێگایانەی کە لەسەر دایك و باوکەکان پێویستە بیگرنەبەر لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیاندا. هەڵبەت لەمڕۆدا بەهۆی ئەو

کاریگەرییە کلتوورییە بێوێنەیەی لەئارادایە هێندەی تر گرنگی بەخشیوەتە ئەو پرسە، دیارە ئەو خەڵکەی لە خەمی شوناسی ئاینی خۆیاندان چەندین پرسیاریان لەبارەی چەندین چەمك و هەڵوێست و بابەت لە لا گەڵاڵە بووە و، خوازیاری ئەوەن بۆچوون و دیدگای بیروباوەڕ و ئاینی ئیسلامی لەبارەوە بزانن.

هەستیش دەکەم ئەمڕۆ لەسەر ئاستی خێزان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان سەرمان لێشێواوە و، نازانین چۆن چۆنی مامەڵە لەگەڵ لێشاوی ئەو کەلتوور و فەرهەنگە بیانیانەدا بکەین کە لە هەموو لایەکەوە بەسەرماندا باریون، بەوەشەوە نەوەستاوە کار گەیشتووەتە ئەوەی کە دابەشبوونی کۆمەڵایەتی لێبکەوێتەوە و، زۆرێك لەو داب و نەریتانەی کە جێگەی ڕێز و لەبەرچاوگرتن بوون تێڕوانینی جیاوازیان تێبکەوێت، تەنانەت لێکترازانێك لە خەم و ئاواتەکانیشماندا بەدیدەکرێت، ئەمەش زۆر مەترسیدارە؛ چونکە خەم و ئاواتەکانن کە کرۆکی دیدگا و دینداریمان دەردەخەن، بۆیە هەر کات خەم و ئاواتەکانمان جیاوازییان تێکەوت، مانای وایە بنەڕەتی دینداریمان دووچاری گورزی کەمەرشکێن بووەتەوە، هەر کاتێکیش بنەڕەت دووچاری وەها گورزێك بوو، ئیدی هەموو شتێك تێکدەچێت: ئاکار و ڕەوشت، پەیوەندییەکان، هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکان...

نەخوێندەواری بەشێوەیەکی بەرفراوان تیاماندا بڵاوبووەتەوە و، زۆربەی زۆری موسوڵمانان گیرۆدەی دەستی نەبوونی و بێکاریی

پێــوەری ڕاســت و هەڵــەکان بوونیــان نــەبێت، ئەوسـا وەکـو هەسارەیەکمان لێدێت کە لە خولگەکەی دەرچووبێت و هەتا هەتایە لە ئاسماندا وێڵ و دێوانەبێت!

من ناتوانم لەم پەیامەمدا هـەموو ڕووکارەکـانی ڕێـڕەوی خێزانـی موسوڵمانتان بۆ دەستنیشان بکەم، بەڵام پشتیوان بەخوا هەوڵدەدەم دەسـت بخەمـە سـەر چـەندین خـاڵی سـەرەکی کـە دەبنـە مایـەی ڕۆشنکردنەوەی ڕێگە و ئاسوودەکردنی دڵانمان.

لە خوای گەورە داواکارم ئەم کارەم لێوەربگرێت و، بیکاتە مایەی سوود و بەرژەوەندی خوشك و برا موسوڵمانەکانم؛ بە ڕاستی هەر ئەو زاتێکی بیسەرە و بەدەم داواکارییەکانمانەوە دێت.

د.عبدالكريم بكار

١٤٢٩/٩/٩ کۆچی

ئێمە لەم پەیامەماندا هەوڵدەدەین ئەو شێوازە باوەی لە نووسین و دانانی پەرتووکە پەروەردەییەکاندا پەیڕەو دەکرێت بشکێنین، چونکە لەو باوەڕەداین زۆرینەی دایك و باوکەکان پێویستیان بە ڕێنشاندەر و پشتیوانێکە تا هاوکارییان بکات لە پێکەوەنانی خێزانێکی موسوڵمان و دیندار و هۆشیار و هاوچەرخدا، واتە: بەرچاوڕۆشنییەك دەدەینە کەسی پەروەردەکار کە چی بکات و، چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵەکانی بکات لە ڕووە تیۆری و کردەییە جیاوازەکانەوە. پێویستە لێرەدا ئاماژە بەوە بکەم کە کاری ئێمە لێرەدا هەوڵێك نییە بۆ پێکەوەنانی خێزانێکی ئاسایی، بەڵکو هەوڵێکە بۆ پێکەوەنانی خێزانێکی بەختەوەر و سەرکەوتوو. خێزانێك کە بە باشیی لە ئاینەکەی تێبگات و لەگەڵ ڕۆح و پێویستییەکانی سەردەمەکەیدا هەڵبکات و، ئاسوودەیی و کامەرانی باڵی بەسەردا کێشابێت، لەبەر ئەوە لەوانەیە خوێنەری بەڕێز وا هەست بکات کە باس لە بابەتێکی خەیاڵی و ناواقیعی دەکەین کە دوورە لە ژیانی

زۆربەی خێزانەکانەوە، کە دواجار هیچ سوودێکی لێوەرناگرێت و پێی وایە کێشەکانی بەم جۆرە پێشنیار و بابەتانە چارەسەر نابن، تا ئەندازەیەکیش ئەو هەستە لە جێی خۆیدایە، بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێم کە ئاستی تێگەیشتن و هۆشیاری زۆربەی موسوڵمانان - سوپاس بۆ خوا - لە گەشەکردنێکی بەردەوامدایە و، دەزانن ئەم قسە و باس و بابەتانە واقیعین و بە ڕووی ئایندەشدا کراونەتەوە و، ژمارەی ئەو خەڵکانەشی سوودی لێدەبینن لە هەڵکشان و فراوانبووندایە، بۆیە بەلاتانەوە ئاسایی بێت کە جیاوازی هەبێت لە نێوان بابەتە پێشنیارکراوەکان و جێبەجێکردنیاندا، ئەوە شتێکە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بوونی هەیە، دەبێت ئەوەش بزانین کە زۆرێك لە دایك و باوکانی هیممەتبەرز و بەرزخوازمان هەن کە بە کەم ڕازی نابن و، هەمیشە چاویان لە شتی باشتر و مەزنترە، هیوادارم ئەوەی لێرەدا باسی دەکەین تینوێتی ئەوان بشکێنێت.

لە ڕاستیدا تێگەیشتن و بەرچاوڕوونی خێزانی موسوڵمان لەمەڕ ڕەوش و ئەرك و پێداویستی و دەرفەتە بۆ هەڵکەوتووەکانی و، دیدگای ڕوونی بۆ ئەو سەردەمەی کە تێیدا دەژی، بنچینەی بزاوتن و گەشەکردنیەتی، بەڵێ بێگومان لە میانی دیدگاوە تێدەگات کە چۆن هەنگاو هەڵگرێت و، چی پێویستە و، هەڵە و کەموکورتییەکانی یان خاڵە بەهێزەکانی دەستنیشان بکات، دیدگا لە لایەکەوە لە نەخشەڕێگا دەچێت و، لە لایەکی تریشەوە دەڵێی ئەو کەتەلۆکەیە کە

کۆمپانیاکـان هاوپێچـی بەرهەمـەکانیانی دەکـەن. دیـدگا ئـەو چێوارچێوەیەیە کـە پێکهاتووە لـە بنـەما و بـەها و چـەمك و هێـڵ و تێبینییە گشتییەکان، بۆیە ئەستەمە بتوانرێت بە شێوەیەکی تەواوکار و بە وردکاری گوزارشتی لێ بکرێت، کەواتـە ئـەو قسانەی دەربارەی ڕێڕەوی خێزان بەگشتی و، دەربارەی دیدگاکەی بەتایبەتی دەیانکەین هەوڵێکە بۆ ڕوونکردنەوەی بەهای دەرککردن بـە گـەورەیی بابەتەکە، جا ئەگـەر ڕێبـاز - هـەر ڕێبازێـك - بریتـی بێـت لـە کۆمـەڵێك چـەمك و بابەتی گونجاو، ئەوا بە کارێکی سوودبەخشی دەزانم کە تـەواوی ئـەم پەیامەم لە چەند وتە و ناونیشانێکی پوختدا کۆبکەمـەوە و، لـەبارەی هەر یەکێکیشیانەوە بەدرێژیی بدوێم:

## ١- خێزانێك سەرچاوەکەی ئیسلام بێت:

ئێمـە خانەوادەیـەکی موسـوڵمانین و پێویسـتە بـە هۆشـیاریی تەواوەوە لە واتای پەرۆشی و ئینتیما بۆ ئـەم دینـە تێبگـەین، بۆیـە کاتێك دەڵێین: ئیسلام سەرچاوەی ژیانی دونیامانـە، ئـەو قسـەیە بۆ ئێمە زۆر شت دەگەیەنێت، لەوانە:

- ئیسـلام سەرچـاوەی پـاك و بێگـەردی بیروبـاوەڕ و ئاکـار و ڕەوشـت و پەیوەنـدی و مامەڵـەکردن و هـەموو کاروبارێکمانـە، وەك ئایەتە پیرۆزەکە ئاماژەی بۆ دەکات: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٢) لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ

﴿الْمُسْلِمِينَ﴾ الأنعام: ١٦٢ـ ١٦٣، واتـه: (ئـەی موحەممـەد! تـۆ بلـێ: بەڕاستی نوێژ و هەموو جۆرە عیبادەتێکم یا حـەج و قوربانیم و هـەر عیبادەتێ لە کاتی زیندوویەتیدا دەیکەم و لەسەری ئەمرم هەمووی بۆ خودایە کە خوای هەموو جۆرە مەخلووقێکە. هاوبەشی نییە و من بەم جۆرە ڕاستی و دڵسۆزی و خاوێنییە لـە لایـەن خـوداوە فـەرمانم پـێ دراوە و من لەپێش هەموو ئوممەتی خۆمەوە موسوڵمان بووم و ڕێگای ڕاستی ئیسلامەتیم گرتووەتەبەر).[١]

- خوا و پێغەمبەری خودامان خۆشدەوێن و، کار بۆ ڕەزامەندی خـوای گـەورە و شـوێنکەوتنی ڕێبـازی پێغەمبەرەکـەمان دەکـەین لـە خۆشی و ناخۆشیدا، شانازی دەکـەین کـە سـەر بـە ئـاییـنی ئیسـلام و ئوممەتی ئیسلامین، ئومێدەواریشین هەموو مرۆڤێك لەسـەر ڕووی ئـەم زەوییـە وەکـو ئێمـە خـوای گـەورە هیدایـەتی بـدات، هـەر بۆیـە هەوڵدەدەین خەڵکی بە ئیسـلام ئاشـنا بکـەین و، منداڵـەکانمان فێـری خۆشویستنی بانگەوازکردن بۆ لای خوا بکەین.

- دەزانین پابەندبوون بە ئیسلامەوە پێویستی بـە تێگـەیشـتنی یاسا و ئادابەکانی هەیە، لەبەر ئەوە دەربارەی بیروباوەڕ و ژیاننامـە و فیقه و تەفسیر کتێب دەخوێنینـەوە و، کـار دەکـەین بـۆ ئـەوەی کە

---

١– سەرجەم مانای ئایەتەکانی نێو ئەم پەرتووکە لە (خولاصەی تەفسیری نامی)ی (مەلا عبدالکریمی مدرس) وەرگیراوە.

کتێبەکانی تایبەت بە کلتووری ئیسلامی شوێن و پێگەی تایبەتیان لە کتێبخانەی ماڵەوەدا هەبێت.

• دەزانین لە ئیسلامدا لە زۆر شتدا بابەتی فەرز و سوونەت و، بۆچوونی بەهێز و لاواز هەن، لەبەر ئەوە ئێمە پرسیارە شەرعییەکانمان نابەینە لای کەسانێك کە بێ متمانە و ناشارەزابن و، هەوڵدەدەین لە شتێك دوور بکەوینەوە کە ناکۆکی لەسەر بێت، لەگەڵ ئەوەشدا پێمان وایە ڕاجیایی پێشەواکان لەبارەی بابەتێکەوە ئاسانکارییەکە بۆ خەڵکی.

• دڵمان بۆ ئیسلام و موسوڵمانان دەسووتێت و، دەستی یارمەتییان بۆ درێژ دەکەین و، هەوڵیش دەدەین ببینە پێشەنگ بۆ خەڵکی تر.

• بایەخ بە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و جوان خوێندنەوەی و لێوردبوونەوەی دەدەین و، منداڵەکانیشمانی لەسەر هان دەدەین.

• گەورەترین ئامانجمان لەم دونیایەدا بریتییە لە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە و بەهەشتی نەبڕاوە، ئامادەی هەموو قوربانیدانێکیشین لەو پێناوەدا.

• ئێمە لەو پێناوەدا زۆر یادی خوا دەکەین و، هەوڵدەدەین دەست بە سوننەت و ئادابەکانی پێغەمبەری خواوە بگرین، هەروەها بە پرسیارگەلی تایبەت بە بوونی خوا مێشکی منداڵەکانمان زاخاو دەدەین و، لە هەمان کاتیشدا وەڵامی پرسیارەکانیشیان دەدەینەوە

و، له نێو خۆشماندا گفتوگۆ دەربارەی حاڵی موسوڵمانان دەکەین و، هەوڵی گرتنەبەری هەموو هۆکارێك دەدەین بۆ کەمکردنەوەی ئازار و مەینەتییەکانی سەر شانیان، کە کێشەیەکیش لە ناو خێزانەکەدا دروستدەبێت، ئەوا لە چوارچێوەی بەها و بنەما و ئاکار و ڕەوشتە ئیسلامییەکانماندا ڕێگەچارەی بۆ دەدۆزینەوە و، دەیکەینە دەرفەتێك بۆ یادخستنەوەی تەواوی ئەندامانی خێزان بەو بەها و ڕەوشتە جوان و بەرزانە.

## ٢- هەرچی دەستکەوت و زیانەکانی ئەم دونیایەن کاتیی و سنووردارن:

دید و تێڕوانینی خێزانی موسوڵمان بۆ سروشت و خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیانی دونیا بەشێکی گرنگی دیدگای گشتیی ئەو پێکدەهێنێت، بۆیە کاتێك ئەو دیدگایە کێشە و گرفتێکی گەورەی تێدەکەوێت، ئیدی هەموو شتەکان تێکدەچن.

لە ڕوانگەی ئێمەوە دونیا کێڵگەی دوارۆژە، ئێمە خوازیاری ئەوەین خوای گەورە بەرەکەت بخاتە کارە چاکەکانمانەوە، هەروەك ئەو جوتیارەی تۆو لە خاکێکی بە پیتدا دەوەشێنێت و خوازیاری بەرهەمی جوان و نایابە، خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ الزلزلة: ٧-٨، واتە: (جا هەرکەسێك بە قورسایی گەردیلەیێ چاکەی

کردبێت پاداشەکەی دەبینێت و، هەرکەسیش بە قورسایی گەردیلەیێ خراپەی کردبێت سزاکەی دەبینێت).

موسوڵمانی ڕاستەقینە لە دونیادا دڵی وابەستەی دواڕۆژە؛ چونکە دەزانێت مانەوەی لە دونیادا کاتییە و، پێویستە لەسەری توێشوو بۆ ژیانی هەتاهەتایی کۆبکاتەوە، ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) لەسەر حەسیرێك نوستبوو، کە هەڵسا حەسیرەکە چەقیبووە لاتەنیشتی و جێگەی تاڵەکانی لاقەبرغەی چاڵ کردبوو، گوتمان: قوربان! بریا دۆشەکێکمان بۆ دروست دەکردی! فەرمووی: ((مَا لِي وَمَا لِلدُّنْيَا؟! مَا أَنَا فِي الدُّنيا إلاَّ كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ، ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا))[1] واتە: ((من لە کوێ و دنیا لە کوێ! حاڵی من لەم جیهانەدا وەك حاڵی سوارێکی ڕێبوار وایە کە لەژێر سێبەری درەختێکدا وچانێ بگرێت و پشوویێ بدات لە پاش کەمێك بڕوات بەڕێی خۆیەوە و درەختەکە بەجێ بهێڵێت))[2]. خوای گەورەش لەو بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ وَالآخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ اتَّقَى وَلاَ تُظْلَمُونَ فَتِيلاً﴾ النساء: ٧٧، واتە: (جا تۆ پێیان بڵێ: ڕابواردنی دنیا شتێکی زۆر کەم و بێبەقایە، بەڵام بۆ ئەو کەسەی لە خودا بترسێت ڕۆژی قیامەت و خۆشی و

---

١ – تیرمیذی: ٢٣٦٧

٢ – مانای فەرموودەکانی نێو ئەم پەرتووکە لە پەرتووکی: ریاض الصالحین، وەرگێڕانی نووری فارس، چاپی سێیەم، ٢٠٠٦، وەرگیراون.

پاداشەکەی زۆر چاکترە. بێگومان خودا عادڵ و بەڕەحمە و، ئێوە بە قەدەر پەردەی ناو دەنکە خورمایەك ستەمتان لێ ناکرێت). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ مَتَاعٌ﴾ الرعد: ٢٦، واتە: کەچی ئەم ژیانی دنیایە لەچاو ژیانی قیامەتدا ڕابواردنێکی کەم و ناچیز و بێبایەخە.

هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەربێت) هەڵگری بیرۆکەی کورتخایەنی ژیانی ئەم سەر زەوییە بوون، بە خۆشی و ناخۆشی و چێژ و و ئازارەکانییەوە، هەرچی تێدایە کاتی و سنووردار و کورتخایەنە، بۆیە زۆر گرنگە بەو دیدگا و تێگەیشتنەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین.

## ئەمە چ پەیوەندییەکی بە پەروەردەکردنی منداڵانەوە هەیە لە لایەن خێزانی موسوڵمانەوە؟

**پەیوەندییەکە لێرەدا خۆی دەبینێتەوە:**

- بەو پێیەی هەرچی شتی ئەم دونیایەیە کاتیی و سنووردارە؛ ئیدی کاتێك خێر و چاکەیەك دێتە ڕێمان یان لە کارێکدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنین یاخود دەوڵەمەند دەبین پێویست بە لەخۆباییبوون ناکات. لە هەمان کاتدا مل کەچ ناکەین و هیوابڕاویش نابین و، لە بەرامبەر ئازار و ناڕەحەتی و مەینەتییەکاندا چۆکدانادەین؛ چونکە

دڵنیاین هەموو ئەو شتانە کۆتاییان دێت و، خوای گەورە ئەو بارە دەگۆڕێت بۆ بارێکی دی.

ئەندامی خێزانێک بەهۆی نەخۆشکەوتنی لە کاتی یەکێک لە تاقیکردنەوەکانی قۆناغی ئامادەیی دەرنەچوو و ئەو ساڵە مایەوە، ئەوەش نیگەرانی زۆری لێکەوتەوە و، برادەرەکانیشی هەر یەکەیان بە چەشنێک هاوخەمی خۆیان بۆ دەربڕی، ئەویش لە لایەن خۆیەوە زۆر سوپاسی ئەو هاوسۆزییەی کردن و، پاشان گەڕایەوە ماڵەوە و، هەواڵی دەرنەچوونەکەی بە گوێی خێزانەکەیدا درا، لە لایەک دایکی نیگەرانی خۆی نیشاندا و، لە لایەکیش باوکی و تەواوی ئەندامان هاتن بەرەو ڕووی و هاوخەمی خۆیان بۆ دەربڕی، یەکێک لەو قسانەی کە خوشکێکی پێی گوت: "گوێی پێمەدە خۆ دونیا ئاخیر نەبووە، سبەی کەمتر بیری لێدەکەیتەوە و، پاش چەند ڕۆژێکی تر هەموو شتێک ئاسایی دەبێتەوە، ئیدی باش وایە لە ئێستاوە بەخۆتدا بچیتەوە و هەڵەکانی خۆت دەستنیشان بکەیت و، پلانێکی تۆکمە دابنێیت بۆ کاری سبەینێت". باوکیشی پێی وت: "ڕۆڵەکەم! پاش بیست ساڵی دیکە هیچ جیاوازییەک بەدی ناکەیت لە نێوان بەدەستهێنانی بڕوانامەی ئامادەیی ئەم ساڵ و ساڵی دواتر، ئەوەی لە تواناتدا بوو کردت، نەخۆشکەوتنەکەشت لە دەسەڵاتی خۆتدا نەبوو".

باوەڕ و دیدگا ورد و نەخشە بۆداڕێژراوەکانمان بۆ دەستکەوت و زیانەکانی دونیا دەستەبەرێکی باشن بۆ ئەوەی بتوانین لە هەموو

بارودۆخەکاندا پارێزگاری لە هاوسەنگییەکانمان بکەین، ئەوەشی کە بەسەر ئەو گەنج و خێزانەدا هات نموونەیەکی وەهابوو.

- چاو نابڕینە ڕزق و ڕۆزی کەس و ئیرەیی بە کەس نابەین و، بەشداری پێشبڕکێیەکی پاوانخوازی و بەکاربەریی لەگەڵ هیچ کەسێکدا ناکەین، کاتێکیش چاومان بە کەسانێك دەکەوێت کە لە سەرچاوە گوماناوییەکانەوە هەڵپەی بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانیان، دەبێت ئێمە بەچاوی بەزەیی پێداهاتنەوەوە بۆیان بڕوانین؛ چونکە ئەو دەستپاکی و دڵپاکییەی لە کیسیان دەچێت زۆر لەو قازانج و دەستکەوتانە زیاترە کە بەدەستیان دەهێنن.

گەر بێتو بەڕاستی لە خوا بترسین و دەستپاك بین، نە ڕزق و ڕۆزیمان کەم دەکات و، نە لە کاتی خۆیشیدا دوادەکەوێت، ئەمە دیدگای ئێمەی موسوڵمانە بۆ ژیان.

## ٣- هەموو حەرامکراوێك زیانێکی هەر هەیە:

شەریعەتی ئیسلام وەك ئیبن قەییم (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت: سەرتاپای ڕەحمەت و دادگەری و بەرژەوەندییە. بەڵێ، هەروەها سۆز و نەرمونیانیی و چاکەیە، بێگومان هەرچی شتی حەرام و قەدەغەکراو یان پێچەوانەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) هەن، زەرەر و زیانێکیان هەر تێدایە، چ ماددی یان

مەعنـــەوی وەکـــو: درۆکـــردن، ناپـــاکی، دووزمـــانی، جنێـــودان، ســووخواردن، خــواردنی مـاڵی خـەڵکی بـە ناهـەق، خـواردنی گۆشتی بـەراز، خواردنـەوەی مـەی و، بـەکارهێنانی مـاددە هۆشبـەرەکان و دووکەڵکـەرەکان... تـەواوی ئـەو شتانە بەشێوەیەك لـە شێوەکان زیانیان بۆ سەر تەندروستیمان یان بۆ شێوازی ژیان و گوزەرانمان یان ژیانی کۆمەڵایەتیمان دەبێت. ئەو زیانانەش هەیانە دیار و ئاشکران و هەشیانە نادیارن، هەروەها هەشیانە زوو پێوەتـەوە دیـاری دەدات و، هەشیانە لە ئایندەدا سەرهەڵدەدەن، هەربۆیە خێزانی موسوڵمان پێی وایە باشترین شت ئەوەیە کە دەست بە یاساکانی شەرعەوە بگیرێت و شوێن سوونەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێـت) بکـەوین، جا ئێمـە هەروەك چۆن هەموو قەدەغەکراو و سەرپێچییەك بە یەك چاو تەماشا ناکەین، ئاوهاش زیانەکانیشیان بە یەك چاو تەماشا ناکەین، بەڵام تـا ئاستی هۆشیاری و تێگەیشتنی خێزانی موسوڵمان بەرەوپێشتر بچێت، ئەوا دەستپاکتر دەبێت و زیاتر و زیاتر خۆی لە سەرپێچیکردن و شتە قەدەغەکراوەکان دەپارێزێت.

چەندین خێزانی موسوڵمان هەن هەوڵی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوایان داوە لە زوو نووستندا، دوو کاتژمێر لە پاش نوێژی خـەوتنان گڵۆپـەکان دەکوژێننـەوە، منداڵـەکانیان ڕاهێنـاوە لەسـەر ئـەوەی کـە ئەرك و کۆششی وانەکانیان بەر لـە نوێـژی عیشا کۆتـایی پێبهێـنن و، دوای نوێژکردنەکـەش نـانی ئێوارەیـان دەخۆن، ئینجا کـاتێکی کـەم

پێکەوە بەسەر دەبەن، پاشان هەر یەکەیان ڕوو لە جێگەکەی دەکات، ئەم جۆرە خێزانانە بەرەکەتی زوو لەخەو هەستانیان بۆ خۆیان مسۆگەر کردووە، بە شەونوێژکردن و تەوبە و پاڕانەوە و قورئانخوێندن.. بەڕاستی دیمەنێکی ناوازەیە و گەورەیی ئەو خانەوادەیە دەردەخات، هەڵبەت جیا لەوەش نووستنی پێشوەخت سوود و قازانجی ماددیشی هەیە، بە گوێرەی توێژینەوەکان دەرکەوتووە کە زوو نووستن زۆر باشتر و سوودبەخشترە بۆ لەش لە درەنگ نووستن.

خێزانی پەیامدار و چاکەکار؛ دەروونپاکتر و، لەشساغتر و، تێگەیشتووترە لە خێزانەکانی تر.

## ٤- بەرژەوەندیی خێزانمان هاوشێوەی بەرژەوەندیی میللەتەکەمانە:

حەقیقەتی تاقیکردنەوەی خوایی لە ژیانی کۆمەڵایەتیماندا خۆی لە جیاوازی حەز و ئارەزوو و تەبیعەت و بۆچوون و بەرژەوەندییەکانماندا دەبینێتەوە، جا هەر کاتێك توانیمان پەنجە بخەینە سەر ناوەڕۆك و خاڵە سەرەکییەکان ئەوا لە تاقیکردنەوەکە دەردەچین، بێگومان پەیوەندیی نێوان ئێمە و نەتەوە و کۆمەڵگەکەمان وەك پەیوەندی نێوان بەش و گشت و، بناغە و دیوار وایە، جا ئەگەر خێزانەکانمان چاکەخواز و بەهێز و تێگەیشتوو و بەرهەمدار بن، ئەوا میللەتەکەشمان وەها دەردەچێت.

ئێمە کاتێک خزمەتی خەڵکی دەکەین و خزمەتگوزارییان پێشکەشدەکەین و، فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە دەکەین و، پشتگیریی خەڵکی بێدەسەڵات و ستەملێکراو دەکەین، ئەوا سوودمان بە خودی خۆمان گەیاندووە، چونکە لە چوارچێوەی خۆویستی و بەرژەوەندی تەسکی تاکەکەسی ڕزگارمان کردووە، هەروەها سوودیشمان بە نەتەوە و میللەتەکەمان گەیاندووە؛ چونکە بەو کارەمان توانیومانە ئەو بەها و بنەمایانەی کە میللەتەکەمان بڕوای پێیانە بەرجەستە بکەین، هەروەها بەو کارەمان ڕەوشی هەندێ لە پێکهاتەکانی گەل و نەتەوەکەمان باش دەکەین و، کێشەکانیان لەسەر سووک دەکەین، شەهیدانیش باشترین سەلمێنەری قسەکانی ئێمەن، ئەوان بە گوێرەی بیری تەسک و تێگەیشتنی دونیایی و لێکدانەوەی کەسانی نەزان؛ گیانیان لەدەستداوە و ژیانیان لەکیسچووە، هەر بەهۆی گیانلەدەستدانەکەشیانەوە ژنەکانیان بێوەژن خستوون و منداڵەکانیان هەتیو خستوون، بەڵام بە تێگەیشتنێکی گەورە و قووڵ وا نییە، بەڵکو ئەوان گرەویان بردووەتەوە و، سەری میللەتەکەیان بەرزکردووەتەوە و، بەرگریان لە خاکی وڵاتەکەیان کردووە، خوای گەورە ماڵ و منداڵەکانیان بێ هیوا ناکات. بۆیە بەڕاستی هەر زیانێک لە هەر بوارێکدا دووچاری هەر تاکێک لە تاکەکانی میللەت ببێت، ئەوا میللەتیش بەخۆیەوە تێوە دەگلێنێت، بەپێچەوانەشەوە هەر تاکێکی

یا هەر خێزانێکی میللەت بەرەوپێشچوونێك بەخۆیەوە ببینێت، خۆیشی پشك و پریشکی بەردەکەوێت.

منداڵێك لەماڵەوە ڕووداوێکی بۆ خێزانەکەی گێڕایەوە و، وتی: هاوڕێیەکی بە ناهەق تۆمەتبارکراوە بە دزینی پێنووسی هاوڕێیەکی تری و، باسی ئەوەی بۆ کردن کە ئەو دەزانێت کێ دزیویەتی، بەڵام لە ترسی ئەوەی کێشەی بۆ دروست نەبێت نەیوێراوە هیچ بڵێت، لێرەدا دایکی دەنگی لێ بەرزبووەوە و وتی: "کوڕی خۆم کارێکی هەڵەت کردووە؛ چۆن دەبێت موسوڵمان پشتی برا ستەملێکراوەکەی بەربدات، دەبێت سبەینێ بچیتە لای بەڕێوەبەری قوتابخانە و هەموو شتێکی بۆ بگێڕیتەوە، تاوەکو دز و تاوانباری ڕاستەقینە سزای خۆی بچێژێت و، بێتاوانیش بەناهەق تاوانبار نەکرێت". لە خێزانێکی تریشدا کچێك گێڕایەوە و، وتی: "دراوسێکەمان کە سپلێتەکانی ماڵەکەیان هەڵدەکەن جاری وایە بە هەفتە و دوو هەفتە گەشت و گەڕان دەکەن بەبێ ئەوەی بیانکوژێننەوە". باوکی پێی وت: "ئەی تۆ چیتکرد؟" وتی: "هیچ، ئەوە بابەتێکە پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیە!" باوکی وتی: "ئەوە هەڵوێستێکی نابەجێیە، چونکە لەوانەیە بەو بۆنەیەوە ئاگر بەربێتە خانووەکە، هەروەها ئەو کارە بەفیڕۆدانی پارە و کارەبایە کە یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکان، دەبێت ئامۆژگاری دراوسێکەمان بکەین تاوەکو دەست لەو کارانە هەڵگرن."

هیچ شتێك وەك ئیسلام بەرژەوەندی تاك و كۆمەڵگە و نەتەوە بە یەك چاو سەیر ناكات، جا بە ئەندازەی پابەندبوونمان بە ڕێنماییەكانییەوە هەست بەو یەكسانییە دەكەین و، هەوڵی بەرجەستەكردنی دەدەین.

## ٥- چەندین ڕەفتار لای منداڵەكانمان گەلاڵە بوون، تا گەورە نەبن، لێیان تێناگەین:

مرۆڤ كە لەدایك دەبێت كەسایەتییەكی ناتەواوە، بەڵام بە درێژایی تەمەن و ساڵ بە ساڵ باشتر تێدەگات و پێدەگات، بێگومان تێگەیشتن و دانایی و هاوسەنگی كارانێكی مەزنن و، ڕەنگە بەر لە تەمەنی چل ساڵی بە نسیبی هەموو كەسێك نەبن، لەبەر ئەوە منداڵی تەمەن حەوت ساڵان و هەشت ساڵان چەندین كێشە و گرفتی هەیە؛ لەوانەیە درۆ بكات و، بە خەیاڵیشیدا نەیەت؛ چونكە جیاوازی ناكات لە نێوان ڕاستی و خەیاڵدا و، نازانێت كە پێویستە قسەی مرۆڤ ڕاست و دروست و هاوتای واقیع بێت، لەبەر ئەوە بەبێ شەرمانە درۆ دەكات.

ڕەنگە منداڵی تەمەن دوازدە ساڵانیش هەڵسوكەوتێكی نەشیاوی بەرامبەر باپیرەی لێبوەشێتەوە، بەبێ ئەوەی بزانێت كارێكی ناڕەوای كردووە، یان لەوانەیە منداڵی پێنج ساڵان دزیی ئەنجام بدات؛ چونكە

هیچ جیاوازییەك لە نێوان دزیکردن و خواستن ناکات و، بەو شێوەیە... ئەمە واتای چییە؟

**ئەمە چەند شتێك دەگەیەنێت:**

- خۆشبوون لە هەڵەی منداڵان، ڕەنگە ئەوان بزانن کە فلانە کردەوە هەڵەیە، بەڵام ناتوانن بەپێی پێویست کۆنترۆڵی خۆیان و هەست و سۆزەکانیان بکەن.
- بەردەوام گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەین، تاوەکو بتوانین ئەزموون و شارەزاییمانیان بۆ بگوازینەوە.
- بە سنگێکی فراوانەوە وەڵامی پرسیارەکانیان بدەینەوە.
- کارێکی باش دەکەین گەر بێتو ئەو هەڵانەی خۆمان لە تەمەنی ئەواندا تێیان کەوتووین بهێنینەوە یادمان، لەوانەشە هەڵەکانمان لەو تەمەنەدا زۆر لە هەڵەکانی ئەوان گەورەتر بن.

## ٦- خۆمان باشتر دەناسین، گەر بێتو خۆمان بە هاوتاکانمان بەراورد بکەین:

زۆر گرنگە کە خێزانی موسوڵمان چاو کراوە بێت و ئاگای لە ڕەوش و بارودۆخی خۆی بێت و، پێگەی خۆی لە کۆمەڵگەدا بۆ دەربکەوێت و، بزانێت کە تا چ ئاستێك سەرکەوتوو و شکستخواردووە، بێگومان بەشێکیشی لە ڕێی پابەندبوونەوە بە یاسا و ڕێسا جوانەکانی شەریعەتی ئیسلامەوە دەپێورێن، بۆ نموونە کاتێك خێزانێکی موسوڵمان کەمتەرخەمی لە کاروباری نوێژ یان ڕۆژوو یان

زەکات ئەنجام دەدات، دەزانێت کە سووکایەتی بە پایەیەکی گەورە لە پایەکانی ئیسلام دەکات، جا دەشێت ئاشنای بەشێکی ژیان و واقیعی خێزان ببین لە میانی بەراوردکارییەوە لەگەڵ ئەو خێزانانەی کە باری ژیانیان هاوشێوەی باری ژیانی ئەوانە و توانا و دەرفەت و گیروگرفتەکانیان لەیەکترەوە نزیکە، خۆناسین بەشێکە لە ناسینی کەسی دی، جا ئەگەر توانیمان کەسەکەی تر بناسین، ئەوا توانیومانە باشتر خۆمان بناسین. بۆ نموونە بابەتەکانی خۆشگوزەرانی و، هەستکردن بە ئارامی و سەقامگیری بابەتانێکن ڕێژەیین، واتە ئەو کەسەی کە لە شوققەیەکی خۆش و بەرفراوانی نێو گەڕەکێکی پڕ لە خانوو و ئاپارتمان و باڵەخانەی خۆش و دڵڕفێندا نیشتەجێیە هەست بە خۆشگوزەرانی ناکات، بەڵام ئەگەر ئەو شوققەیەی لە نێو گەڕەکێکی میللی پڕ لە خانووی قووڕدا بێت، ئەوا دەبێتە جێگەی ڕەزامەندی و ئاسوودەیی ئەو، بابەتەکە هەمان شتە بەڵام ژینگە و دەوروبەرەکەی سەنگەکەی دەگۆڕن. دەبێت بەراوردکردنەکە بەجێ بێت؛ چونکە تۆ کە خۆت بە کەسانی زۆر جیاواتر لە خۆت بەراورد دەکەیت، ئەوا لەوانەیە ئەنجامی بەراوردکارییەکە نەخوازراو یاخود نائومێدکەر بێت.

پێویستە لە کاروباری دونیادا دەست لە بەراوردکاریی لەگەڵ کەسانی دەسەڵاتدار و دەستڕۆیشتوو و پایەبەرزدا هەڵگرین؛ چونکە ئەوە دەبێتە مایەی ناڕازیبوون لەو بەخششانەی کە خوا بەسەرماندا

ڕژاندوویەتی، بەراوردکاریی دەشێت هۆکارێك بێت بۆ سوپاس و ستایشکردنی خوای گەورە، بۆیە کاتێك خێزانێك دەبینێت خوا منداڵی زیرەك و سەرکەوتووی پێبەخشیوە، ئەوا دەبێت سوپاسی خوای لەسەر بکات، جاری واشە بەراوردکاریی دەبێتە هۆکارێك بۆ بەخۆداچوونەوە و ڕاستکردنەوەی هەڵەکان، ئەوەش کارێکی زۆر باشە.

## ٧- دەزانین ئەم سەردەمەی تێی کەوتووین زۆر ئاڵۆزە، لەبەر ئەوە بە باشترین شێوە منداڵەکانمانی تێدا پەروەردە دەکەین:

ژیان لە هەموو سەردەمێکدا پێویستیی خۆی هەیە، دیارە لە هەموو سەردەمێکیشدا جۆرەها کێشە و گرفت سەرهەڵدەدەن، هەڵبەت سەردەمەکەی ئێمەش لە ڕووی خۆشگوزەرانی و دابینبوونی پێویستییەکانەوە جیاوازە لە سەردەمەکانی پێشتر، بەو پێیەشی – وەك کەمێك پێش ئێستا ئاماژەم پێدا- ژینگە سەنگ و بەهای شتەکان دەگۆڕێت، کەوابوو ناکرێت لە داب و نەریت و تێڕوانینی هاوتا و هاوشانەکانمان بۆ شتەکانی دەوروبەرمان لابدەین.

خێزانی موسوڵمان لەسەر کاروباری دونیا ڕکابەریی لەگەڵ هیچ کەسێکدا ناکات و، لاساییکەر نییە و کوێرانە شوێن کەس ناکەوێت، لە هەمان کاتیشدا لەگەڵ سەردەمەکەی خۆیدا هەڵدەکات و گۆشەگیریی

و دواکەوتوویی قەبوڵ نییە و، ڕێز لە داب و نەریتە ڕێزلێگیراوەکانی کۆمەڵگە دەگرێت.

ئەگەر خەڵکی بوونی بەفرگریان بە پێویست زانی، ئەوا ناکرێت تۆ بیخەیتە ڕیزی جوانکارییەکانەوە، پێداگرییش لەسەر وەها تێگەیشتنێك، ڕووبەڕووی ڕەخنەت دەکاتەوە لە لایەن خانەوادەکەتەوە و، دواتر بە کەسێکی خەڵەفاوت دەزانن و خەفەتی پێدەخۆن، ئەگەریش هاتوو خێزانە هاوتاکانی خێزانەکەی تۆ باری داراییان باش بوو و بۆنە و ئاهەنگەکانیان لە ئۆتێل و هۆڵەکانی شاییدا سازکرد، ئەوا تۆش ناتوانیت ئاهەنگی هاوسەرگیریی ڕۆڵەکەت لەسەربانی خانووەکەتدا یان لە دەشتێکی وشك و کاکی بەکاکی ساز بکەیت، دەنا هەر غەمبار و دڵشکاو دەبیت..

**خێزانی موسوڵمان و پەیامدار هەموو ئەو شتانە دەزانێت، هەربۆیە بە چەند کارێك خۆی بۆ ئامادە دەکات:**

- گیانی بەردەوامی و کۆڵنەدان لە ناخی ڕۆڵەکانیدا دەچێنێت.
- فێری دانبەخۆداگرتنیان دەکات و، گۆشیان دەکات لەسەر دواخستنی حەز و ئارەزووەکانیان.
- گۆشیان دەکات لەسەر دامەزراوی و ڕەوشتبەرزی و ڕێزگرتنی خەڵکی.
- گیانی هەرەوەزییان تێدا بەهێز دەکات، تاوەکو بتوانن بە شێوەی تیم کار بکەن.

- ئەوەی لە دەستی بێت بۆیانی دەکات، تاوەکو بتوانن لە باشترین شـوێندا فێـری زانسـت و زانیـاری بـبن و، بـەرزترین بڕوانامـە بەدەست بهێنن و، ڕایاندەهێنێت لەسەر سوود وەرگرتن لە کات.

ڕەنگە ئەم باس و خواسانە لـەم پەیامـەدا زۆر دووبـارە ببنـەوە؛ چونکە وەك کلیلـی سـەرەکی وان بـۆ تـەواوکردنی کەسایەتی مرۆڤـی موسوڵمان و، ژیانی خێزانی موسوڵمان.

## ٨- زۆربەی ئەو کێشانەی ڕووبەڕووی خێزانەکانمان دەبنەوە نێوخۆیین:

ئەمەش یەکێکە لە یاسا و ڕێساکانی خوای پەروەردگار لـە کـاری بەدیهێناندا، ئەوەی ڕاستی بێت خەڵکی چ وەك تاك و چ وەك خێزان و کۆمەڵگە ڕووبەڕووی کێشە و گرفتـی هەمەچەشـن بوونەتـەوە، هەیانـە بەهۆی سروشت و سـەختیی ژیانەوەیـە و، هەشـیانە بـەهۆی ستەم و نـادادی خەڵکەوەیـە، هەشـیانە بـەهۆی کەمتەرخـەمی و هەڵـەی کەسییەوەیە. کاتێـك سـەرنجێك لـەم ئایەتانـە دەدەیـن، ئـەوا بۆمـان دەردەکـەوێت کـە بـەزۆریی کێشـەکە نێوخۆییـە، خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنْفُسِكُمْ﴾ آل عمران: ١٦٥، واتـە: (ئـەی موحەممـەد! پێیـان بڵـێ: ئـەو بـەڵاو کزییـەی تووشـتان بـوو خـەتای خۆتان بوو کە بەگوێی پێغەمبەرتان نەکرد).

﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لاَ يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا﴾ آل عمران: ١٢٠، واته: (ئێوە ئەگەر خۆتان بگرن و لە خودا بترسن ئەوان بە فێڵ و پیلان ناتوانن زیانتان پێ بگەیێنن).

خێزانی موسوڵمان پێویستی بەو جۆرە هۆشیارییەیە تاوەکو بکەوێتەوە سەرپێی خۆی و چارەسەری کێشەکانی بکات.

لە یەکێك لە خانەوادەکاندا لەسەر گۆڕینی کەلوپەلی ناوماڵەکە دەمەقاڵەیەك لە نێوان ژن و مێردەکەدا دروستبوو: پیاوەکە نیازی گۆڕینی کەلوپەلە بێکەڵك و هێشتنەوەی کەلوپەلە بەکەڵکەکەیەتی، بەڵام ئافرەتەکە دەیەوێت هەمووی بگۆڕێت، ناکۆکییەکەیان بە بنبەست گەیشت و، دەنگیان لەیەکتری بەرزکردەوە و، کار گەیشتە لێکجیابوونەوە، ڕۆژی دواتر کوڕە گەورەی ئەو ماڵە -کە چەند مانگێك بوو زانکۆی تەواو کردبوو- دانیشتنێکی لەگەڵ دایکیدا ساز کرد و دەربارەی کێشەکە پرسیاری لێکرد، دایکەش لە وەڵامدا وتی: "باوکت ڕێگر نییە لە گۆڕینی تەواوی کەلوپەلی ناو ماڵەکە، بەڵام دایکی ڕێگریی لێدەکات"، ئەو گەنجە هەمان پرسیاری لە باوکی کرد، ئەویش وتی: "هەموو خەتای هاوڕێکانیەتی، ئەوانن فێری ئەو شتانەی دەکەن، ئەو بەر لە هەفتەیەك لەگەڵ قسەکەی من هاوڕا بوو". سەر لە ئێوارە کوڕە لاوەکەیان چاوی بە باوك و دایکی کەوت و پرسیارەکەی لێ دووبارە کردنەوە دەربارەی گۆڕینی کەلوپەلی ناوماڵەکە، ئینجا وتی: "کێشەکە نە بەهۆی قسەی داپیرەمەوەیە و، نە بەهۆی قسە و

حەزی هاوڕێیانی دایکمەوەیە، بەڵکو کێشەکە لەوەدایە کە خۆتان کۆنەبوونەتەوە و گفتوگۆ و ڕاوێژی پێویستتان نەکردووە دەربارەی بڕیارە یەکلاکەرەوەکان، پێم وانییە شتێکی ڕەوابێت کە خێزانێك لەسەر کەلوپەلی ناو ماڵ لەبەریەك هەڵوەشێت، بۆیە بەو هۆیەوە پێشنیارم وایە کە ئەو پرۆژەیە تا شەش مانگی دیکە دوابخەین تاوەکو دڵی ئەو کەسانەی کە شکاوە بێتەوە سەرخۆی"، ئەوەبوو هەردوولا بە خۆشحاڵییەوە ڕەزامەندییان دەربڕی، تەنانەت دایکەکەش بە کوڵ بۆ کوڕەکەی پاڕایەوە لەبەر ئەو هەڵوێستە بوێر و ژیرانەیەی کە نواندی.

خێزانێکی تر بۆی دەرکەوت منداڵەکەیان - ئەوەیان کە لە قۆناغی ناوەندیدایە - جگەرە دەکێشێت، پاش گەڕان و بەدواداچوون ئاشکرابوو کە خاڵۆزاکانی کاریان تێکردووە و فێری ئەو کارەیان کردووە، بۆیە دایکی کوڕە بڕیاریدا دەربارەی ئەو بابەتە براکەی بدوێنێت، بەڵام باوکی کوڕە وتی: "کارێکی باش دەکەیت کە براکەت ئاگادار دەکەیتەوە لە جگەرەکێشانی منداڵەکانی، بەڵام ڕەوا نییە بەرپرسیارێتی ئالودەبوونی منداڵەکەمان بەو کارەوە بخەینە ئەستۆی منداڵەکانی، بەڵکو ئەوە لە ئەستۆی ئێمەدایە و ئێمە لێی بەرپرسین؛ چونکە ئەگەر بە باشی ئاگامان لێی بوایە و، لەسەر دینداریی ڕاستەقینە گۆشمان بکردایە، ئەوا بەپێچەوانەوە ئەم هانی خاڵۆزاکانی دەدا دەست لەو کارە هەڵگرن، بۆیە ئەم کێشەیە دەرفەتێکە و بۆ

ئێمە هەڵکەوتووە تاوەکو بەخۆماندا بچینەوە و لاپەڕەیەکی نوێ لەگەڵ پەروەردەکردنی منداڵەکانمان هەڵبدەینەوە."

## ٩- بڕوامان وایە ئایندەی گەش لە هەناوی واقیعێکی نەخوازراوەوە نایەتە دونیاوە:

ئاینەکەمان فێری ئەوەمان دەکات کە هەموو کارێک بەدەستی خوایە و، داهاتووش غەیب و نادیارە، بەڵام لە تەک ئەوەشدا داوامان لێدەکات کە هۆکارەکان بگرینەبەر و، لێکۆڵینەوەی وردی هەر هەنگاوێك بکەین کە دەمانەوێت بینێین.

یەکێك لە خانەوادە ڕۆشنبیر و تێگەیشتووەکان کۆبوونەوەیەکی دووروودرێژیان سازدا و، تێیدا چەند شیرینی و خواردنەوەیەکی گەرم خورایەوە، لە نێوان دایك و باوك و کچە گەورەکەیان گفتوگۆیەکی گەرم دەربارەی ئایندەی خێزانەکە و چۆنیەتی بەرەوپێشبردنی سازدرا، وا دیاربوو کچەکە شارەزایی باشی لە بابەتە پەروەردەییەکاندا هەبوو، بۆیە لەو قسانەی کردنی: "ئێمە ناتوانین ئایندەی خێزانەکەمان بنەخشێنین، بەڵام دەتوانین ئەو هۆکارانە بگرینەبەر کە بە پشتیوانی خوا خێزانەکەمان بەرەو ئایندەیەکی گەش و پڕشنگدار بەرێت"، باوکی وتی: "ڕۆڵەکەم، ئەو هۆکارانە چین؟" وتی: "لێکۆڵینەوەیەکی وردی ئەو هۆکارانە بکەین کە دەمانەوێت بیانگرینەبەر، تاوەکو بەپێی توانا بڕیاری دروست بدەین"، دایکی وتی: "ئەوە شتێکی زۆر ڕاست و دروستە، شتێکی دیکەش هەیە

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێکردووە و دەفەرموێت: ﴿وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى﴾ طه : ۱۳۲، واتە: (ئەنجامی باشیش بۆ ئەوانەیە لە خوا دەترسن و خۆیان لە کاری خراپ دەپارێزن)

واتە ئەگەر هاتوو لە خوا ترساین، ئەوا عاقیبەتی کارەکانمان لە دونیا و دوارۆژدا بە خێر و چاکە دەشکێتەوە."

ئیدی هەمووان لەسەر دوو خاڵ ڕێککەوتن:

یەکەمیان: بڕیاردانی دروست و، دووەمیشیان: ژیان لە سایەی گوێڕایەڵیکردنی پەروەردگاردا.

خێزانێکی دیکە پلانێکی وردیان بۆ خوێندن و فێرکردنی منداڵەکانیان دانابوو و، ۱۰٪ی داهاتەکەیان بۆ دەخستنە یەکێك لە بانکەکانەوە، ئەم بڕە پارەیەیان تەرخان کرد بۆ ئەو کوڕ و کچانەیان کە خوازیاری تەواوکردنی خوێندنی باڵان، لە ماوەی پازدە ساڵدا ئەو خێزانە بڕە پارەیەکی باشیان بۆ کۆبووەوە و، بەهۆیەوە کوڕێکیان توانی پلەی ماستەر لە بواری کارگێڕیی کاردا بەدەست بهێنێت و، هەروەها کچێکیشیان توانی پلەی دکتۆرا لە بواری پزیشکیدا بەدەست بهێنێت و، دکتۆرەیەکی بەناوبانگی لێهەڵکەوت! بەڵێ خێزانی ژیر و سەرکەوتوو بەبێ گرتنەبەری هۆکارەکان و، لێکۆڵینەوەی وردی ڕووداو و پێشهاتەکان و، پشتیوانیی خوای گەورە هیچ هەنگاوێك هەڵنانێت.

## ١٠- هەوڵی زانینی جیاوازییەکانی نێوان ئەوەی بووە و ئەوەشی دەبێت دەدەین:

ئەمە پرسێکی زۆر گەرم و گرنگە بۆ تاك و خێزان و کۆمەڵگە و دەوڵەت و هەموو دام و دەزگایەك. خێزان ئەگەرچی لە ئاستێکی یەکجار بەرزیشدا بێت، بەڵام هێشتا زۆر شتی تری لەبەردەمدایە تاوەکو بەرەوپێشتر بچێت.

گرنگترین شتێك کە لەسەر خێزانی موسوڵمان پێویستە لێی ڕابمێنێت ئاستی دینداری و ڕۆشنبیریی ئێستایەتی و، ئەو پەیوەندییەیە کە لەگەڵ تاکەکانیدا هەیەتی، هەڵبەت لە میانی گفتوگۆ و تێگەیشتنی بەردەوام هەم لای باوك و دایکەکە و هەمیش لای منداڵە پێگەیشتووەکانیان ڕەخنە و قسە و باس لەسەر ڕەوشی ئێستای ئەو خێزانە گەڵاڵە دەبێت، بێگومان زۆر شتی ناکۆك بە هەڵپەسێردراوی دەمێننەوە، بەڵام ئەوە گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە کە شتانێکی زۆر هەن تاکەکانی خێزان لەسەریان تەبان، جا خێزانی موسوڵمان لە میانی کلتووری ئیسلامییەوە و، لە میانی تێگەیشتنی سەردەمەکەیەوە چ ڕەوشێکی پێ باش بوو با بیگرێتەبەر، ئەوسا ئەو ماوەیەی کە لە نێوان ڕەوشی ئێستا و ئەوەی خوازیارە بیگاتێ بریتی دەبێت لەو مەیدانەی کە ئەسپی خۆی تێدا تاو دەدات.

باوکێك بە کوڕە گەورەکەی وت: "تۆ چ شتێك لە خێزانەکەماندا بەدیدەکەیت؟" کوڕەکەی وتی: "مەبەستت چیە؟" باوکی وتی:

"دەمەوێت بپرسم: ئایا ئێمە خانەوادەیەکی سەرکەوتووین لە مامەڵەکردنماندا لە نێوان یەکتریدا یاخود نا؟" کوڕەکەی وتی: "باوکە ڕێم پێدەدەیت کە ڕاشکاونە بدوێم؟" باوکی وتی: "بێگومان"، کوڕەکەی وتی: "خێزانەکەمان عەیبی نییە، بەڵام وا بۆ دوو ساڵ دەچێت وا هەست دەکەم کە بەڕێزت هەر بە ئەنقەست و بەبێ هیچ هۆیەك و بۆ هەموو شتێك سەرپێچی دایکم دەکەیت، ئەوەش سارد و سڕی و نیگەرانییەکی تێدا دروستکردووین"، باوکی وتی: "قسەکەت ڕاستە، بەڵام دایکیشت بە ئەنقەست بێگوێیم دەکات"، بۆ سەلماندنی قسەکانیشی چەندین نموونەی بۆ هێنایەوە. کوڕەکەی وتی: "باوکە قسەکانت ڕاستن و گومانیان تێدا نییە، بەڵام ئاخر ناکرێت ئەمە هەروا بەردەوام بێت"، کوڕەکەی هەمان باسی لەگەڵ دایکیدا کردەوە، دواجا خێزانەکە کۆبوونەوە و، لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕێککەوتن:

- لە شتی بچووك و لاوەکیدا نە باوکەکە دەمەدەمێ لەگەڵ دایکەکەدا بکات و نە دایکەکەیش دەمەدەمێ لەگەڵ باوکەکەدا بکات.
- ئەگەر کەسێکیان ڕاوبۆچوونێکی خۆی دەربارەی کاروباری خێزانەکە دەربڕی و، ئەو بۆچوونە بەدڵی ئەوی دیکەیان نەبوو، ئەوا با لەسەرخۆ و بە نەرمونیانی دەریببڕێت و مشتومڕی لەسەر نەکات.

- ئەگەر قسەیەکیش کرا بە دڵی ئەوی تریان بوو، ئەوا دەبێت کەسی دووەم ستایشی ئەو قسەیە بکات و دەستخۆشی لە بکەرەکەی بکات.
- دایك و باوك بە بەرچاوی منداڵەکانەوە مشتومڕ لەسەر بابەتێکی ئاڵۆز و دژوار نەکەن، تاوەکو خێزانەکە دابەش نەبێت بۆ دوو بەرە و پشێوی تێ نەکەوێت.

ئەم ڕێکەوتنە چووە بواری جێبەجێکردنەوە و، گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لە ژیانی ئەو خێزانەدا هاتەئاراوە و، وای لێهات باوکیان لە شوێنانی تردا ئەو ئەزموونە سەرکەوتووەی - بەبێ ناوهێنان - بە نموونە دەهێنایەوە، بەو هۆیەشەوە دایك و باوکانێکی زۆر سوودیان لێبینی.

لاوێك ماڵپەڕێکی لەسەر ئینتەرنێت دروستکرد، ئەم ماڵپەڕە بایەخی بە بواری گەشەپێدانی کەسیی دەدا، بابەتی پەرەپێدانی ژیانی کەسیی و خێزانیی و شوێنەکانی کارکردنی زۆر بەهەند وەردەگرت، بۆیە ڕۆژێکیان بە باوکی وت: "باوکە، خێزانەکەمان هەڵی ئەوەی لەبەردەستدایە ببێتە پێشەنگ و، نموونەیەکی جوان پێشکەشی ناسراوانمان بکات"، باوکی وتی: "چۆن؟" کوڕەکەی وتی: "زۆر بە ئاسانی دەتوانین ئەو کارە بکەین، سەری هەموو مانگێك کۆبوونەوەیەکی کراوە ساز بکەین و، لەو کۆبوونەوەیەدا پرسیارێك دەربارەی بابەتێك بوروژێنین و، هەوڵبدەین وەڵامی بدەینەوە."

باوکی وتی: "مەبەستت چییە؟" کوڕەکەی وتی: "بۆ نموونە لە سەرەتای مانگی داهاتوو پرسیارەکەمان ئەوەبێت: چی بکەین تاوەکو کتێب لە دڵی خێزانەکەماندا شیرین بکەین؟ سەری مانگێکی دیکە: پرسیارەکەمان - بۆ نموونە - بریتی بێت لە: چی بکەین تاوەکو بڕێک پارە لە داهاتەکەمان پاشەکەوت بکەین بۆ ئەوەی بتوانین لە داهاتوودا خانوویەکی پێبکڕین؟ بەو شێوەیە..."

باوکی بەو بیرۆکەیە زۆر سەرسام بوو، پاش پێنج مانگ کارکردن بەو بەرنامەیە ئەو خێزانە هەستی بە گۆڕانکارییەکی زۆر کرد لە ژیانیدا، بەڵام بەداخەوە ئەو کۆبوونەوانە درێژەیان نەکێشا، هەرچەند ناوبەناو دایکیان دەیوت: با بگەڕێینەوە بۆ جاری جاران.

## ١١- شیکردنەوەی هەڵە گەورەترین سەرچاوەی سەرلێشێوانە:

ئەم بابەتە یەکێکە لە بابەتە گرنگەکانی ڕوانگەسازی، لامان ڕوونە کە دەقە شەرعییەکان زۆر جەختیان کردووەتەوە لەسەر مەسەلەی درۆکردن، چونکە درۆکردن ڕاستییەکان دەشێوێنێت و، بیسەرەکانیشی چەواشە دەکات، بەڵام لەبەر ئەوەی درۆکردن ئاکار و ڕەوشتێکی قێزەون و نەویستراوە، دەبینیت کە خەڵکی سڵی لێدەکەنەوە و خۆیانی لێ بەدوور دەگرن، هەروەها زۆر کات دەتوانین لە ڕاستیی و دروستی ئەو هەواڵانەی دەیانبیستین دڵنیابینەوە، بەڵام شیکردنەوەی هەڵە شتێکی جیاوازە، چونکە لەوانەیە هەڵەکە لە

ئـەنجامی ئیجتیهادێکـەوە کەوتبێتـەوە، زۆر جـاریش خـەڵکی سڵی لێناکەنەوە؛ چونکە لە کاتی ئەنجامدان و پەیڕەوکردنیدا هەست ناکەن بەهەڵەداچووبن، بۆیـە دەبینیت چەواشـەکاریی و هەڵەتێگەیشتن کـە بەهۆی شیکردنەوەی هەڵـەوە پەیـدادەبن تـا ئەندازەیـەکی زۆر لـەناو خەڵکدا بڵاوبوونەتەوە.

ئێمە ڕووداوەکان بە چاوی خۆمـان دەبیـنین، بـەڵام بـە ئـەقڵ و ئاوەزمان شییان دەکەینـەوە، ئـەقڵ و ئاوەزیشمان کاتێـك سـەرقاڵی شیکردنەوە و ڕاڤەکردنی ڕووداوێك یان دیاردەیـەك دەبێت ڕاستەوخۆ بەو کـارە هەڵناستێت، بـەڵکو بـەهۆی چـەند ئامرازێکـەوە ئـەو کـارە ئـەنجام دەدات، ئـەو ئامرازانـەش بـریتین لـەو پێناسـە و چـەمك و زانیارییانەی پەیوەندییان بەو بابەتەوە هەیە کە دەمانەوێت تێیبگەین و شییبکەینەوە، لەم بارەیەوە لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕنـەوە کـە فەرمویـەتی: ((پشت بـە دید و بۆچـوونی مامۆسـتای شـارەزا ببەسـتە، نـەك بـە دیـد و بۆچـوونی هـەرزەکار، ئەگەرچی هەرزەکارەکە بەدوو چاوی خـۆی ڕووداوەکـەی ببینیبێـت))، چـونکە هـەرزەکار ڕاسـتە شـتەکە یـان ڕووداوەکـە بـە چـاوی خـۆی دەبینێـت، بـەڵام لـە ڕاڤەکردنیـدا دەستەوەسـتان دەوەستێت، بۆیـە مامۆستاکە دێت باشتر لەوەی هەرزەکارەکە وتویەتی ڕاڤەی دەکات.

خێزانەکان بەدەست چەندین شیکردنەوەی هەڵـەوە دەنـاڵێنن و، تووشی چـەندین گرفـت و قـەیران دەبـن، بـێ ئـەوەی هۆیـەکانیان بـۆ

دەربکەوێت: ئەمە ئافرەتێکە دەیەوێت مێردەکەی دڵخۆش بکات، بۆیە سوعبەت و قسەی خۆشی لەگەڵدا دەکات، مێردەکەشی وا گومان دەبات کە ئەو ڕەفتارەی مەرامێکی لەپشتە و مەبەستیەتی شتێکی بۆ بکرێت، بەڵام ئافرەتەکە ئەوە ڕەتدەکاتەوە، ئیدی ئاژاوە سەرهەڵدەدات. ئەوەش پیاوێکە بەهۆی هەڵسوکەوتی منداڵێکییەوە پەست و تووڕەبووە، کەچی هاوسەرەکەی وا دەزانێت کە لەو تووڕەیە و، تووڕەییەکەشی هۆیەکی لەپشتەوەیە و ناهەقییە، بۆیە سەرزەنشتی دەکات و ناڕازییە لە قسەکانی، ئیتر ساردوسڕی دەکەوێتە نێوانیانەوە.

ئەمەش کوڕێکە بەهۆی کاریگەریی ئامۆزاکانی بەسەریەوە لە قوتابخانە دەرناچێت، ئەوان هانیانداوە تا کار و پیشەکەی ئەوان بکات، کەسوکارەکەشی کەوتنەکەی بە کارێکی گەمژانە و بێ ئەقڵانە لێکدەدەنەوە. ئەوەش کوڕێکی دیکەیە دەچێتە لای هاوڕێیەکی تاوەکو پێکەوە لە وانەکاندا کۆشش بکەن، کەچی کەسوکارەکەی دەڵێن: "نا ئەوە بۆ ئەوە چووە بۆ لای تاوەکو یاری لەگەڵدا بکات، نەوەك بۆ سەعی و کۆششکردن". ئەوەش بەخێوکاری خێزانێکە بەهۆی نزمیی ئاستی توانای کارکردن و بێئاگایی لە کارەکەیدا بە فەرمانی بەڕێوەبەرەکەی لە کارەکەی دووردەخرێتەوە، کەچی ئەو وا گومان دەبات کە بەڕێوەبەرەکەی بەهۆی کێشەیەکی کەسییەوە ئەو کارەکەی کردووە، یان بۆ ئەوەی خزمێکی خۆی بخاتە جێگەکەی...

ڕاستییەکەی ئەوەیە کە خەڵکی تێگەیشتنێکی هەڵەیان بۆ بارودۆخی خۆیان و جیهانی دەوروبەریان هەیە، ئەمەش هەمووی بەهۆی کەمتەرخەمی خۆیانەوەیە لە گەڕان بەدوای ڕاستییەکان و ڕاوێژکردن بە شارەزایان.

**خێزانی هوشیار هەوڵدەدا بە وردی لە شتەکان بگات، بۆ ئەو کارەشی بەم هەنگاوانەی خوارەوە هەڵدەستێت:**

١. پەلە لە شیکردنەوەی دۆخی خۆی و، ئەو ڕووداوانەی بەسەر تاکەکانیدا هاتوون ناکات.

٢. هەوڵدەدات گوێ لە چەند ڕاڤە و شیکردنەوەیەك بگرێت و، بەراورد لە نێوان ئەو شیکردنەوانەشدا دەکات کە دەیانبیستێت و، باشترینیان هەڵدەبژێرێت.

٣. پرس و ڕاوێژ بە کەسانی پسپۆڕ و شارەزا دەکات.

٤. بابەتی هەمەچەشن دەخوێنێتەوە و تاوتوێی ڕووداو و باس و بەسەرهاتەکان دەکات و فێری بابەت و چەمکی نوێ دەبێت، تاوەکو بەو چەمکانە بگاتە ڕاستترین ڕاڤە و شیکردنەوە.

٥. لە توانایدایە پاشەکشە لە تێگەیشتن و شیکردنەوەی هەڵە بکات و، ڕێگەچارە و جێگرەوەی تری بۆ بدۆزێتەوە.



# بەهاکانمان

ڕەوشت و ئاکار و بەهاکان بنچینەی سەرەکی ژیانی تاك و خێزان و گەلانی دونیا پێکدەهێنن، هەرکاتێك ڕەوشت و بەهای خێزانێك بەرەو هەڵکشان دەچێت لایەنی دەروونی ئاسوودە دەبێت، هەر کاتێکیش ڕەوشت و بەهای کۆمەڵگەیەك دادەڕمێت لایەنی دەروونیشی وێران دەبێت، ئیدی بەرەبەرە ژیار و شارستانیەتیەکەشی تیادەچێت.

ئێمە ڕەوشتمان هەیە و بەهاکانیشمان هەن، بەڵام بەهاکان بەرفراوانترن لە ڕەوشتەکان، دەشتوانین بڵێین کە: هەموو ئاکار و ڕەوشتێك بەهایە، بەڵام هەموو بەهایەك ئاکار و ڕەوشت نییە، پارە نرخ و بەهایەکی گرانە، بەڵام ڕەوشت نییە، هەروەها دیمەنی سیحراوی و سەرنجڕاکێش بەهایە و ڕەوشت نییە. بەهاکان کۆی بەهان و بەهای هەر شتێکیش بریتییە لە: ڕێز و پێگەی ئەو شتە لە دڵ و دەروونەکاندا، بێگومان شتە زۆر بەبەها و بەنرخەکان شوێنی خۆیان لە دڵ و دەروونی خەڵکیدا پاراستووە و جێگەی ڕێز و پێزانینن لای زۆربەی زۆری خەڵکی، بۆ نموونە بەخشین و ڕاستگۆیی و ئازایەتی

و پارە و هاوسۆزیی و... بەهای بەرز و بەڕێزن، بەدەگمەن کەسێکت بۆ هەڵدەکەوێت گرنگییان پێنەدات.

بەهاکان بە زۆری (پێداویستین) بۆ تاکەکان، ئینجا لەوەدوا دەبنە پێداویستی کۆمەڵایەتی: هەڵەیەکت بەرانبەر دەکەم لێم خۆشدەبیت، ئیدی منیش چاکەی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری تۆم هەرگیز بیر ناچێتەوە و ئاواتەخوازم ڕۆژێك بێتە پێشەوە پاداشتت بدەمەوە، بۆیە کاتێك کەسێك هەڵەیەکم بەرانبەر دەکات، منیش لێی خۆشدەبم؛ چونکە ئیتر دەزانم مانا و بەهای لێبووردەیی چەند گەورەیە، بەو شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە بەهاکان لەسەر بناغەی پێویستییەکان دروست دەبن.

بەهەمان شێوە بەها مادییەکانیش لەسەر بناغەی (پێویستییەکان) دروست دەبن، واتە ئەو شتە هەتا زۆرتر داواکاریی خەڵکی لەسەر بێت، ئەوا بەهاکەی زیاتر بەرز دەبێتەوە، هەمووشمان بەسەرهاتە بەناوبانگەکەی یەکێك لە خولەفاکانمان بیستووە کاتێك پەرداخێك ئاویان بۆ هێنا تا بیخواتەوە، یەکێك لە ئامادەبووان پێی وت: "ئەی ئەمیری باوەڕداران! ئەگەر تینوێتی تەنگی پێهەڵچنیت و پێویستیت بەم پەرداخە ئاوە بوو، بەڵام پێت نەدرا، ئەوسا بەچەند دەیکڕیت؟" خەلیفە وتی: "بە نیوەی سەروەتەکەم دەیکڕم!"

کەوابوو بەهاکان کۆمەڵێك پێوەرن لە میانەیانەوە بڕیار لەسەر کردەوە و حەز و هەڵوێست و پەیوەندییەکانمان دەدەین: بۆ نموونە

ئێمە هەر هەموومان چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا بە یەکێك لە بەها بەرز و باڵاکان لەقەڵەم دەدەین، بۆیە کاتێك چاومان بە کەسێك دەکەوێت کە ڕێز لە دایکی ناگرێت و لێی دەدات، ئەوسا ئێمەش بە چاوێکی سووکەوە تەماشای دەکەین و، لەوانەشە پۆلیسی لێ ئاگادار بکەینەوە، ئەگەر ئەو کەسە ناسراو و هاوڕێشمان بێت ڕەنگە پەیوەندی لەگەڵدا بپچڕێنین، چونکە لە ڕێی ئەو هەڵوێستەی کە لەگەڵ دایکیدا نواندی هەڵمان سەنگاند و بڕیارمان لەسەر دا.

قومارکردن بەهایەکی خراپ و نەرێنییە، بۆیە ئەگەر چاومان بە کەسێك کەوت کە خەریکی قومارکردنە، ئەوا بە چاوێکی سووك و کەم بۆی دەڕوانین، بشچێتە خوازبێنی هەر کچێك دەبینیت زۆربەیان ئامادەنین شووی پێبکەن زۆربەی خێزانەکانیش ئامادەییان تێدا نییە کچەکەیانی بدەنێ، چونکە لە ڕوانگەی ئەو گوناه و تاوانە گەورەیەی کە ئەنجامی دەدات هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەو کەسە کردووە و بڕیاری کۆتاییان لەسەر داوە، بەو شێوەیە...

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ڕێز و پێزانینی خەڵك بۆ بەهاکان نەگۆڕ نییە و، دەشێت بە گوێرەی پێویستی دۆخەکە بەرز و نزمیی تێبکەوێت، بۆ نموونە ئەو کەسەی کە لە دەشت و بیابانێکی وشك و کاکی بە کاکیدا تەنها نیو پەرداخ ئاو شك دەبات و، لەو نیو پەرداخ ئاوەی بەشم دەدات، هیچ کات وەکو ئەو کەسە نییە کە لە مزگەوتێکدا پەرداخێك ئاوم بۆ دەهێنێت، ئەو کەسەشی کە لە بکوژی

منداڵەکەی خۆش دەبێت، هەرگیز وەکو ئەو کەسە نییە کە لە کەسێک خۆشدەبێت کە لە قەرەباڵغییەکدا پێ بە قاچیدا دەنێت، ئەو کەسەشی کە لە مانگێکدا سەد هەزار دینار دەداتە دایکی، لە کاتێکدا مووچەی مانگانەی پێنجسەد هەزار دینارە، هیچکات وەکو ئەو کەسە نییە کە سەد هەزار دەداتە دایکی و مووچەکەی سێ ملیۆن دینارە، ڕاستە هەردووکیان چاکەکردنە، بەڵام ڕێژەی بەخشینی هەر یەکەیان لە چاو ئەو مووچەیەی کە مانگانە وەریدەگرێت جیاوازە، لەبەر ئەوە تێڕوانینەکەش بۆ هەردوولایان جیاوازە. باش وایە لێرەدا ئەوە بڵێین کە: خوای گەورە بیر و تەبیعەتی ئادەمیزادەکانی لێکچوو یان لێکنزیک دروستکردووە، تەنانەت زۆربەی پێداویستییەکانیشی هەروا دروستکردووە، هەروەها ئەزموونی گەلانیش دیسان لە زۆر شتدا هاوشێوەن، کە دواجار لە هەموو ئەو شتانەدا ژمارەیەکی بێشومار بەهای هاوبەش دروستدەبن، کە بە بەها جیهانییەکان ناودەبرێن، بۆ نموونە دلێریی و بەخشین و پیاوەتی و چاکەکردن و ئارامگرتن و جوانی و هاوسۆزیی و سەربەخۆیی و ئازادی و هێز و دەسەڵات و پارە و خاکیبوون و نەرمونیانی و لێبوردەیی و... هەموویان بەهای هاوبەشی جیهانین.

پرسیارێک لێرەدا دێتە پێشەوە: **ئەگەر وابێت، ئیدی چۆن جیاوازی لە نێوان گەلان و شارستانیەتەکان و خێزانەکاندا**

دروستدەبێت و، چۆن خێزانێك لە ڕووی ڕەوشتەوە لە خێزانێکی دیکە باشتر دەبێت؟

وەڵامەکە خۆی لە دوو خاڵدا دەبینێتەوە:

یەکەمیان: دەبێت خێزانەکە بڕوا بە چەند بنەما و بەهایەك بهێنێت کە خێزانەکانی دیکە بڕوایان پێی نەبێت، بۆ نموونە خێزانی موسوڵمان بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە و ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورەیە و، تێڕوانینی تایبەتی هەیە دەربارەی خەتەنەکردن و شوورەیی و پەیوەندی نێوان هەردوو ڕەگەز، هەروەها دەربارەی چەند خواردەمەنی و خواردنەوەیەك، ئەمانەش کاریگەریی تەواو دەکەنە سەر هەڵوێستەکانی و ڕێڕەوی ژیانی بە گشتی، ئەمەش بە ئاشکرا دیارە و نکوڵی لێناکرێت.

دووەم: ڕیزبەندی بەهاکان و پلەی گرنگیپێدانەکە، ئەمەش ئەو خاڵە سەرەکییەیە کە جیاوازی لە نێوان زۆربەی تاك و خێزان و نەتەوەکاندا دروستدەکات، جا ئەگەر نەتەوەکانی جیهان لە زۆربەی بەهاکاندا هاوبەش بن، ئەوا هەر تاکە و هەر خێزانە و هەر کۆمەڵگەیەك و... پەروەردەیەکی تایبەتی هەیە بۆ ئەو بەهایانەی کە بڕوای پێیانە: بۆ نموونە: خواردنی نانی بەیانی بەهایە و، گەیشتنە شوێنی کارکردن لە کاتی دیاریکراودا بەهایەکی ترە، هەشە بەهای یەکێکیان بەسەر ئەویتردا دەدات، بۆ نموونە ئەوەی کە خواردنی نانی بەیانی بەلاوە بەبەهاترە، ئەوا تا نانی بەیانی نەخوات ناچێت بەدەم

شوێنی کارکردنەکەیەوە تەنانەت ئەگەر دواکەوتنی بەدواوە بێت، ئەو کەسەشی ئامادەبوونی لە کاتی دیاریکراودا لە شوێنی کارکردنی بەلاوە گرنگتر و بەبەهاتربێت، ئەوا نانخواردنی بەیانیی دوادەخات.

پارەپەیداکردن بەهایە و، دەستپاکی و دەستخستنی پارە لە ڕێگای یاساییەوە بەهایەکی ترە، جا ئەگەر بەهای پارەکە لای فلانە کەس بەبەهاتر بوو لە خەڵکی، ئەوا بێ گوێدانە سەرچاوەی بەدەستخستنەکەی هەرچی لە توانایدا بێت دەیخاتەگەڕ، بەڵام ئەو کەسەی کە دەستخستنی پارەی لە ڕێگەی حەڵاڵەوە لە لا بەبەهاتر بێت، ئەوا بەهەر شێوەیەك بووە خۆی لە پارەی حەرام دەپارێزێت، بەو شێوەیە.. یاساکەش دەڵێت: خەڵکی بەهای سووك و بێ نرخ دەکەنە قوربانی بەهای بەرز، ئەوەش یاسایەکی ڕەوایە.

شتێکی تر کە دەخوازم لەم پێشەکییەدا ئاماژەی پێبدەم ئەوەیە کە: بەهاکانی خێزانی موسوڵمان هەڵقووڵاوی عەقیدە و یاسا شەرعییەکانیەتی، شەریعەتی بەرزی ئیسلامیش ئاماژەی بە چەندین بەهای نەرێنی کردووە، ئەڵبەت بەها ئەرێنییەکانیش بەهای بەرز و بەهای نزمیان تێدایە، بەها نەرێنییەکانیش بەهەمان شێوە بەهای بەرز و بەهای نزمیان تێدایە. بۆ نموونە هەرچی فەرز و واجیب بێت بەهایەکی ئەرێنی بەرزە و، دیسان بەها بەرزەکانیش لە چەند پلەیەك پێکهاتوون، هەرچیەکیش مەندوب و سوننەت بێت بەهایەکی ئەرێنی نزمی هەیە، هەرچییەکیش حەرام بێت بەهایەکی نەرێنی بەرزی هەیە،

هەرچییەکیش مەکروه و پێچەوانەی پێشین بێت بەهایەکی نەرێنی نزمی هەیە، هەر بۆیە خێزانی موسوڵمان دەتوانێت لە زۆر کاری ژیاندا پلەی پێشکەوتنی خۆی بپێوێت لە میانی پابەندبوونی بە بەها ئەرێنییە بەرز و نزمەکانەوە و، لە میانی دوورەپەرێزبوونی لە بەها نەرێنییە بەرز و نزمەکان، بێگومان چەندین بەهای دیکەمان هەن دەچنە خانەی ڕێگەپێدراو (مباح)ەوە و، خێزانی موسوڵمان ئازادیی تەواوی بەکارهێنانیانی لەبەردەستدایە، بۆ نموونە خۆی ئازادە لە دیاریکردنی قوتابخانەی گونجاو بە فێرکردنی منداڵەکانی و، ئازادە لە دیاریکردنی کاتی نووستن و لەخەوهەستانی منداڵەکانی و، ئازادە لە چۆنیەتی خەرجکردنی مووچەی مانگانەکەی و، چەندین شتی تری لەو شێوەیە.

من لێرەدا ناتوانم باسی تەواوی ئەو بەها ئەرێنی و نەرێنیانە بکەم کە پێویستە خێزان ئاگای لێیان بێت و بەهەند وەریان بگرێت، ئەوە باسێکی دوور و درێژە، بەڵام لێرەدا ئاماژە بە نۆ بەهای سەرەکی دەدەم:

## ١- نیەتی خێر و چاکەمان هەبێت و، دڵ و دەروونمان لە ئاست یەکتردا پاک بێت:

نیەتی خێربوون، واتە خۆشویستنی ئەو خێر و چاکەیە و، بەرەوپیرچوونی و، هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی، جا بەرەوپیرچوونی خێر و چاکە بەڵگەیە لەسەر خێرخوازیی و دەست و دڵفراوانی کەسی

بەرەوپیرچوو، ئەوەش شتێکی سەرەکییە لە ژیانی خێزانی موسوڵمان و شتێکی گرنگیشە لە گرتنەبەری ئاڕاستە و ڕێڕەوی ڕاست و دروست.

بەهای مرۆڤ لەسەر ئاستی مەعنەوی و واتایی، بەندە بە جۆریەتی ئەو شتەی کە بە ئاواتە بەدەستی بهێنێت، بەڵام لەسەر ئاستی جێبەجێکردن، ئەوا بەهاکەی بەستراوەتەوە بە پلەی چاکەکاریی و دڵسۆزییەکەی لە کارکردندا.

موسوڵمان لە خێر و چاکە و بەخشین دانابڕێت، هەرکاتێکیش دۆخەکە لەبار نەبوو؛ ئەو بەدڵ نیەتی خێر و بەخشینی هەر هەیە و، لە خوای گەورە داواکارە کە کاری بۆ ئاسان بکات، بەم نیەتەش خوا هەر پاداشتی دەداتەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفەرمویێت: (فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَها الله تبارَكَ وَتَعالى عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً)[1] واتە: ((ئەگەر کەسێك ویستی چاکەیەك بکات و، بۆی نەکرا، ئەوە خودا لەلای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسێت)).

زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: ((پیاوێك سەردانی زانایانی دەکرد و دەیوت: کێتان کارێکم پێ نیشان دەدات، کە بەهۆیەوە بەردەوام لە خزمەت خوای پەروەردگاردا بم، نامەوێت هیچ شەو و ڕۆژێك کات و ساتێکم بەسەربێت کارێکم نەبێت کە لە خزمەت خوای گەورە کۆم بکاتەوە، پێی وترا: وەڵامەکەت دەستکەوت، باشترین شت ئەوەیە کە تا دەتوانیت خێر و چاکە بکە، ئەگەر بێزاربوویت - یاخود دەستت لێ

---

١- بوخاری: ٦٤٩٠، موسلیم: ١٣١

هەڵگرت ـ ئەوا با هەمیشە نیەتی کردنیت لە دڵدابێت، چونکە ئەوەی نیەتی ئەنجامدانی خێر و چاکەی لە دڵدابێت وەکو ئەو کەسە وایە خێری کردبێت)).

لە ناو خێزانێکدا نیازی خێرکردن هەمیشە لە ئامادەباشیدابوو، نیازی کاری خۆبەخشانە و، نیازی چاکە و بەخشین و... دیاربوو باوکیان ڕۆڵی سەرەکی بینیبوو لەوەی کە ئەو نیەتانە لە دڵ و دەروونی ئەو خێزانەدا بچەسپێنێت، ئەوەبوو زۆر لەگەڵ منداڵەکانیدا کۆدەبووە و باسی گرنگی بەشداریکردنی منداڵانی لە هەندێ پرۆژەی خێرخوازی بۆ دەکردن، بۆیە چەندین جار ئەو منداڵانە بڕێک پارەیان لە باوکیان بە قەرز دەهێنا بە مەرجێك لە خەرجی مانگانەیان بیبڕێت تاوەکو بەشداری بکەن لە چەند پرۆژەیەکی خێرخوازیدا.

هەندێ جاریش کە ئەمبولانسەکە بەخێراییەکی زۆر بەلای ماڵەکەیاندا تێدەپەڕێت، دەبینین باوکەکە لە خوا دەپاڕێتەوە شیفای ئەو کەسە بدات کە لە ناو ئەو ئۆتۆمبێلەدایە.

دایکیشیان بەهەمان شێوە ڕۆڵێکی باشی گێڕا لەگەڵ کچەکانیدا و، بە گەورەکانی دەوت: هەرکامێکتان حەزیکرد هەڵیبستێنم بۆ شەونوێژ، ئەوا با ئاگادارم بکاتەوە تاوەکو بەخەبەری بهێنمەوە، ئەوانیش زۆر جار ئەو داوایەیان لێ دەکرد، ئێمە زۆر پێویستمان بەوەیە کە بەردەوام گفتوگۆ لەگەڵ منداڵەکانمان بکەین دەربارەی ئەو

پرۆژە خێرخوازیانەی کە دەکرێت پێکەوە ئەنجامیان بدەین، تاوەکو کلتووری نیەتی خێر و چاکەکردن ڕەگ و ڕیشەی خۆی دابکوتێت.

ئەوەندە بەس نییە کە دڵ و دەروون نیەتی خێر و چاکەی تێدابێت، بەڵکو لە تەك ئەوەدا دەبێت لە ژەنگ و ژاڵی ڕووپامایی و ئیرەییبردن و ڕق و کینە و گومانی خراپ و... چەندین دەرد و بەڵای تر خاوێنی بکەینەوە، مەترسیدارترینی ئەو دەردانەش ڕووپامایییە؛ چونکە جۆرێکە لە هاوەڵدانان بۆ خوای گەورە، خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: ((أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنْ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي، تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ))[1]. واتە: ((من لە هەموو کەسێك زیاتر بێ نیازم بە شەریك و هاوبەشیەکەیەوە، لەبەر ئەوە هەرکەسێك کارێك بکات و کەسێکی تر بکات بە هاوبەشی من لەو کارەدا، ئەوا بە خۆی و هاوبەشەکەشیەوە تووڕیی دەدەم!))

دایکێك بە بەردەوامی خواردنی بە کوڕەکانیدا دەنارد بۆ دراوسێیەکی نابینایان، ئەو دایکە بە منداڵەکانی دەوت: "هەر کات خواردنەکە دەبەن، هەوڵبدەن کەس نەتانبینێت و، قەتیش باسی ئەمە لای کەس نەکەن."

ئێمەش پێویستە لەسەرمان کە دڵمان لە ئاستی خوشك و برا موسوڵمانەکانمان پاك بێت، نە ئیرەییان پێبەرین و نە ڕقمان لێیان بێتەوە و، نە زویربین لێیان و، هەوڵبدەین لێبوردەیی و تەبایی و

---

١- موسلیم: ٢٩٨٥

پێکەوەژیان بکەینە ڕێبازی کارکردنمان لەگەڵ هەموو موسوڵمانێکدا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: ((لاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَنَاجَشُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَاناً، الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لاَ يَظْلِمُهُ، وَلاَ يَخْذُلُهُ، وَلاَ يَحْقِرُهُ...))[1]. واتە: ((حەسوودی و بەخیلی بەیەکتر مەبەن و، کۆستە کۆستە[2] لەیەکتری مەکەن و کینە و دەغەز لەیەکتری مەکێشن و، پشت لەیەکتری مەکەن و لە یەکتری لووتەلا مەبن و، کڕیار یان فرۆشیار لەیەکتری هەڵمەگەڕێنەوە و، وەك برا بەندەی خودا بن، موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێت زۆر و ناهەقی لێ بکات و نابێت بە چاوی سووك تەماشای بکات، نابێت پشتی لە زەوی بدات و دەستەشکێنی بکات.))

ڕۆژێکیان کۆمەڵێك لاو لە خوێندنگەیەکدا ڕێککەوتن لەسەر پابەندبوون بە چەند ڕەوشت و ئاکارێکی جوانەوە، لەوانە: ئەگەر باسی یەکێك کرا لە لامان کە دەوڵەمەند و خواپێداوە، ئەوا لە بری ئەوەی ئاوات بە دەوڵەمەندیەکەی بخوازین دەڵێین: "خوا دەرووی خێر لەویش و لە ئێمەش بکاتەوە"، هەر یەکەشمان کە دەچینە ناو جێگەوە و سەردەخەینە سەر سەرین بەر لەوەی بنوێت بڵێت: "پەروەردگارا وا من لە هەموو ئەو کەسانەی ئەمڕۆ خراپەیان لەگەڵدا

---

١- موسلیم: ٢٥٦٤

٢- کۆستە کۆستە: زەم

کردم خۆش بووم، سا خوایە لێم خۆش ببە"، هەروەها دەمکوتکردنی ئەو کەسەی دووزمانی دەکات و، گوێنەگرتن لێی و، بە گوێرەی توانا بەرگری لەو کەسانە بکەین کە ئامادە نین لە هاوڕێیان و خزمان.. خێزانی زۆر هەن منداڵەکانیان لەسەر ئەو ڕەوشتە جوان و بەرزانە پەروەردە دەکەن، بۆیە ئێمەش پێویستە لەسەرمان فێریان بین.

## ٢- کاری خۆبەخشانە سەرچاوەی ئاسوودەیی دڵ و دەروونمانە:

ئەو کاتانەی قۆناغی پێویستییەکانمان تێدەپەڕێنین و چێژ لە جوانکارییەکان (کمالیات) وەردەگرین هەست بە خۆشی و ئاسوودەیی دەکەین، کاتێک میوە دەخۆین بەچێژ و خۆشییەوە دەیخۆین، کاتێکیش سواری ئۆتۆمبێلێکی سەرنجڕاکێش دەبین دیسان هەست بە خۆشی و ئاسوودەیی دەکەین، کاتێکیش پۆشاکی کەشخە و گرانبەها دەپۆشین دیسان هەست بەخۆشی دەکەین، هەڵبەت ئەو هەستەش لە بەدەمەوەچوونی ئەو بابەتانەوە سەرچاوە دەگرێت کە بە دڵی ئێمەن، هەروەها لە هەستی لەخۆڕازیبوونەوە سەرچاوە دەگرێت کاتێک خۆت بە کەسانێک بەراورد دەکەیت کە تەنانەت پێویستییەکانیشیان دەستناکەوێت.

ئێمە کاتێک ئەرکی سەرشانمان جێبەجێ دەکەین، بەڵکو ئەو سنوورەش تێدەپەڕێنین و خەریکی کارانێک دەبین کە زۆرەملێیان تێدا نییە وەکو: سونەتەکان و ڕەوشتەکان و ڕێگەپێدراوەکان، هەست بە

ئاسوودەیی دڵ و ئارامیی ڕۆح دەکەین، هەروەها کاتێکیش دەست لە گوناهە گەورەکان و قەدەغەکراوەکانی تر هەڵدەگرین و، خۆمان دەپارێزین لە گوناهە بچووك و گومانلوییەکان و، ئەوانەشی ڕاجیایی زانایانی لەسەرە دیسان هەست بە ئاسوودەیی دڵ و دەروون دەکەین، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو خواناسانەی خۆپارێزن و لەپێناو خوادا تێدەکۆشن، خەڵکانێکی دڵخۆش و دڵشاد و ئاسوودەن، ئەوەش ڕاستە، بێگومان هەستکردنیشیان بەو خۆشی و کامەرانی و بەختەوەرییە مژدە و پاداشتی پێشوەختی خوای گەورەیە بۆ ئەو کەسانە. ئێمە خوازیاری ئەوەین منداڵەکانمان لەسەر چەمك و واتاکانی خۆبەخشیی پەروەردە بکەین تاوەکو ناخی دەروونیان گەشاوەبێت و، بەشداری بکەن لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکانی کۆمەڵگەکەیان، ئاشکراشە خوای گەورە ژیانی کۆمەڵایەتیمانی وەکو تاقیکردنەوەیەك بۆ لێکردووین تاوەکو ببینێت تا چەند ئەوانەی دەرفەتی کاری کۆمەڵایەتیان لەبەردەستدایە دەستپێشخەری دەکەن و لە کاری خۆبەخشدا بەشداری دەکەن و، تا چەند ئەو کەسانە کات و دەرفەتەکانیان لە شتی پووچ و بێمانا و لادان لە ڕێی ڕاست دەفەوتێنن، چەندین فەرموودەشمان هەن ئاماژە بە جۆرەکانی کاری خۆبەخشی دەکەن و چۆن دەبێتە سەرچاوەی خۆشی و ئاسوودەیی دڵ، لەوانە:

- لابردنی ئەو شتانەی زیانبەخشن و لەسەر ڕێگاوبانەکانن.

- فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە.
- ئامۆژگاریکردنی موسوڵمان و ڕێنوێنیکردنی بۆ کاری چاکە.
- ڕۆڵگێڕان لە ئاشتەوایی نێوان دوو کەس یان دوو لایەن یان دوو...
- ڕوومان خۆش بێت لەگەڵ ئەو کەسانەی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکەین، تەنانەت ئەگەر نەشیانناسین.
- دەستپێشخەربین لە سڵاوکردندا، تەنانەت کاتێك کەسێکی گەورە سڵاو لە کەسێکی بچووك دەکات، یان ئەو کەسەی دانیشتووە سڵاو لەو کەسە بکات کە بەڕێوەیە.
- بەدەمەوەچوون و هاوکاریکردنی موسوڵمانێك و هەڵگرتنی جانتا و کۆڵ و کەولوپەلەکەی، یاخود یارمەتیدانی لەوەی کە ئۆتۆمبێلەکەی بۆ بخەیتەوە ئیش.
- زوو چوون بۆ مزگەوت و، نوێژکردن لە ڕیزی یەکەمدا.
- سەردانیکردنی ئەو خزم و کەسانەی سەردانت ناکەن و تازەکردنەوەی سیلەی ڕەحم.
- ئارامگرتن لەسەر ئازار و ناڕەحەتیەکانی دراوسێ.

ئەمڕۆ خەڵك بەهۆی ژیانی ماددیەوە بۆشاییەکی ڕۆحی و ئیمانییان بۆ دروستبووە، هەموو هەوڵێکیان ئەوەیە کە لە میانی پۆزلێدان و کەشخەبوون و نۆشینی خۆراکی خۆش و لەبەرکردنی پۆشاکی گرانبەها و بوونی خانوو و قاپاغ و ... ەوە ڕۆح و دەروونیان

ببوژێننەوە، کەچی بەداخەوە ئەوەش دادیان نادات و هەست ناک
کە سوودیان وەرگرتبێت؛ چونکە بۆشایی گیان و دڵ و دەروون
بێئاگایی و سەرکەشی و خۆویستییەوە سەرچاوەی گرتووە و،
کاری خۆبەخش و خواپەرستی زیاتر و ئەنجامدانی سوونەتەک
نەبێت پڕ نابێتەوە، ئا ئەمەیە کە پێویستە لەسەر خێزانەکان
بیخەنە چوارچێوەی کارە بایەخپێدراوەکانیانەوە. ژمارەیەک کچ
خۆبەخش بە ڕاسپاردەی دایک و باوکیان ڕوویان کردە خانەکا
چاودێریی کۆمەڵایەتی بۆ ئەوەی خەڵات و دیاری پێشکەش ب
منداڵانە بکەن کە لە نازی ژیان لە ئامێزی خێزانەکانیاندا بێبەشبوو
چەند کیژێکی تریش بەپێی بەرنامەیەکی دیاریکراو لەشێوەی گرووپ
دابەشبوون بەسەر چەند مزگەوتێکدا تاوەکو خاوێنیان بکەنەوە
بۆنخۆشیان بکەن و شتە لەکار کەوتووەکانیان چاکبکەنەوە، هەند
گەنجیش ئینتەرنێت دەکەنەوە تاوەکو بەشداری لە چەندین بابەت
سوودبەخشی کۆڕبەندەکاندا بکەن و بڵاوی بکەنەوە... چەندین کار
چالاکی باش - سوپاس بۆ خوا - لە لای زۆربەی خانەوادەکان برەو
سەندووە، بەڵام ئەوەی پێویستمانە و پێویستە بیکەین زۆر زیاتر
لەوەی کە تا ئێستا کراوە.

## ٣- چاکەکاری و شکۆمەندیی خود:

گەشەکردن و شکۆمەندیی خێزان پێشەکییەکە بۆ شکۆمەندیی کۆمەڵگە و نەتەوەی ئیسلام، لە ڕاستیدا ئاکار و ڕەوشتی بەرز بەبۆنەی چەند خێزانێکی ڕەوشتبەرزەوە نەشونما دەکات، پاشان بەشێوەی پلەبەندی بڵاودەبێتەوە تا دەبێتە بەشێك لە کایە کۆمەڵایەتییەکە و گۆڕانکاریی لە ڕەگ و ڕیشەی ژیانی کۆمەڵگەدا دەکات، بێگومان ڕێبازی پاك و بێگەردی ئیسلامیش تەواوی ئەو ئاکار و ڕەوشتە جوانانەمان بۆ فەراهەم دێنێت کە خێزانەکان بتوانن پەروەردەیەکی دروستی منداڵەکانیانی پێبکەن.

ئەوەی ڕاستی بێت: ئەو ئاکار و کردەوە و ڕەوشتانەی کە پلەی مرۆڤ بەرەو لوتکە دەبەن و دەیخەنە ڕیزی کەسانی چاکەخواز و خاوەن کەسایەتی بەرز زۆرن، لێرەدا بەخێرایی ئاماژە بە هەندێکیان دەکەم:

- خۆهەڵنەقورتاندن لە کاروباری کەسانی دی کە پەیوەندی بەوەوە نەبێت، بە کەس نەڵێت ئەرێ موچەکەت چەندە و، دەستوەرنەداتە کێشەی نێوان باوکێك و کوڕەکەی و... پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: ((مِنْ حُسْنِ إِسْلاَمِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لاَ يَعْنِيهِ)).[1] واتە: ((نیشانەی ئیسلامبوونی مرۆڤ

---

١- تیرمیذی: ٢٣١٨

بە شێوەیەکی جوان ئەوەیە کە هەرچی لە مەبەست و ئامانجی ئەوەوە دوورە وازی لێ بهێنێت.))

- دڵ و دەروون فراوانیی و، خێر و چاکەکردن خەڵکی لەسەر ئەوە ڕادەهێنێت کە ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ خەڵکیش پێی خۆش بێت و، ئەوەشی بۆ خۆی پێی خۆش نییە بۆ ئەوانیش پێی خۆش نەبێت.
- لە کاتی ئاژاوە و ناکۆکییەکاندا، تەڕ و وشك پێکەوە نەسوتێنێت و، شت گەورە نەکات و، چاوپۆشی لە هەڵەکان بکات و، بەرگەی ئازار و دەمدرێژی نەیارەکەی بگرێت.
- دوورکەوتنەوە لەو شوێنانەی گومانی خراپیان لێدەکرێت، تا خەڵکیش گومانی خراپی پێنەبەن.
- دەستگرتن بە خەرجییەکانییەوە و بەفیڕۆنەدانی پارە، تاوەکو لە کاتی پێویستیدا دەست بۆ خەڵکی پان نەکاتەوە.
- هاوڕێکانت خۆشبووێت و بەزەییت پێیاندا بێتەوە و، چاو لە کەموکورتیەکانیان بپۆشیت.
- بەکەم نەزانینی ئەو چاکانەی کە لەگەڵیدا دەکرێت و، بەهەند وەرگرتنیان و، پاداشتکردنەوەی خاوەنەکانیان، سوفیان (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەیفەرموو: ((جاری وابوو کە تینووم دەبوو، پێش ئەوەی خۆم بڕۆم لە مەرکانەکە ئاو بخۆمەوە،

کەسێك خێرا هەڵمەتی دەبرد و ناوی بۆ دەهێنام و تینوێتی دەشکاندم، نەمدەزانی چۆن پاداشتی بدەمەوە)).

- پاکوخاوێنی لەش و لار و، خۆبۆنخۆشکردن و، شیك پۆشین.
- ڕەچاوکردنی داب و نەریتەکان، بەو مەرجەی سەرپێچی شەرعیان تێدا نەبێت.
- ئەوەی بەئاشکرا لە شەرماندا نایکەیت، لە پەنهانیشدا نەیکەیت.
- دوورکەوتنەوە لە خواردنی سەر ڕێگاوبان و شوێنە گشتییەکان.
- دوورکەوتنەوە لە قاچ ڕاکێشان لەبەردەم خەڵکدا لە دانیشتنەکاندا مەگەر پێویست بکات.
- کەمکردنەوەی سوعبەت و گاڵتەکردن و، زیادەڕۆیینەکردن لەو کارە تا لەبەر چاوی خەڵکدا سووك نەبیت، ئیبن عەباس (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ((بەدەم کەسانی سووك و ڕیسواوە پێمەکەنە، دەنا ڕێزت نامێنێت و دەبیتە کەسێکی نامەرد)).
- چاوبڕینە کار و چالاکی گەورە و هیممەتبەرزی و کۆڵنەدان بۆ دەستکەوتی گەورەتر، عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ((هیممەتەکانتان بچووك مەکەنەوە، لە بێورەیی و بچووکی هیممەت خراپترم نەبینیوە کە زیان بە ڕێز و گەورەیی مرۆڤەکان بگەیەنێت)).
- دەستگرتن بە ڕەوشتەکانی نانخواردن، لەوانە: پەلەنەکردن لە نانخواردندا و، خواردن لەبەردەم خۆتدا...

- بەهاناوەچوون و فریاگوزاری و بەسەرکردنەوە لە کاتی کێشە و گرفت و تووشهاتەکاندا.
- بەتەمانەبوونی خەڵك و، دەستپان نەکردنەوە لێیان بەپێی توانا.

لەبەر گەورەیی و گرنگیی مەبەستەکانی پیاوەتی و چاکەکردن، لەسەر خێزانی موسوڵمان پێویستە هەستێت بە نووسینەوەی گرنگترینیان لەسەر تابلۆیەك و بۆ وادەیەکی دیاریکراو (بۆ نموونە شەش مانگ) بە دیواری ژوورەکەیدا هەڵیواسێت، تا بە تەواوی خۆی لەسەریان ڕادەهێنێت، دواتر لای بەرێت و خاڵ و بابەتی تر هەڵبواسێت.. بەو شێوەیە.

چەند خێزانێکی کەم بەم کارە هەستاون و هەستیان بە بەروبوومی گەورەی کارەکەیان کردووە.

## ٤- ڕاستبێژبین:

ڕاستگۆیی یەکێکە لە هەرەبەرزترین بەهاکان، بنچینەیەکی تۆکمەشە بۆ شتێکی زۆر گرنگ، کە ئەویش متمانەیە، من بە ڕاستی ناتوانم بڕوا بە کەسێکی درۆزن بکەم کە جێگەی هەڵوێستەلەسەر کردن بێت، قسەکانیشی لای من هیچ ئەرزشێکیان نییە؛ چونکە قسەی کەسی درۆزن هیچی بەسەر هیچەوە نییە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بەشێوەیەکی زۆر جوان باسی ڕاستگۆیی و درۆمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: ((إِنَّ الصِّدْقَ يَهدِي الى البِرِّ، وَإِنَّ البِرَّ يَهْدِي إِلى

الْجَنَّة، وَإِنَّ الرَّجلَ لَيَصْدُقُ حَتَّى يُكتَبَ عِنْد اللهِ صِدِّيقا، وَإِنَّ الكَذِبَ يَهْدِي الى الفُجُورِ، وَإِنَّ الفُجُورَ يَهْدِي إلى النَّارِ، وإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ كَذَّابًا)).[1]

واتە: ((لە ڕاستیی ڕەحمەت دەبارێت، هەمیشە ڕاستی بکەن بە پیشە، چونکە ڕاستی ئادەمیزاد دەخاتە سەر ڕێگەی چاکە، کردەوەی چاکەش ئادەمیزاد دەخاتە سەر ڕێگەی بەهەشت! پیاوی وا هەیە ئەوەندە ڕاستگۆیە و ئەوەندە سۆراخی ڕاستی دەکات و ئەوەندە عەودالّی ڕاستییە تا لای خودا بە پیاوی ڕاست و ڕاستالّ لە قەلەم دەدرێت و لە دیوانی خودا ناوی بە ڕاست دەنووسرێت و، نەکەن درۆبکەن، چونکە درۆ پیاو دەخاتە سەر ڕێگەی خراپە، کردەوەی خراپەش پیاو دەخاتە سەر ڕێگەی ئاگری دۆزەخ، پیاوی وا هەیە ئەوەندە زۆر درۆ دەکات و ئەوەندە منەیی درۆ دەکات هەتا لەلای خودا بە درۆزن دەنووسرێت.))

هێندە بەسە بۆ مرۆڤ کە ڕاستگۆیی خاوەنەکەی بەرەو چاکە پەلکێش دەکات، چاکەش ناوێکی گشتگیر و کۆکەرەوەیە بۆ هەموو جۆرەکانی خێر و چاکە، وەك بڵێیت کەسی ڕاستگۆ ملی ڕێگەی چاکەکار و ساڵحانی گرتووە. فەرموودەکە بە ئاشکرا هانی موسوڵمانان دەدات کە دەروونیان لەسەر پابەندبوون بە ڕاستگۆیی ڕابهێنن، وەك بڵێیت کەسێك ئەگەر پەروەردەی دەروونی پێنەکرێت،

---

١- بوخاری: ٦٠٩٤، موسلیم: ٢٦٠٧

ناشتوانێت لە هەموو کاتێکدا ڕاستگۆیی بپارێزێت، بەهۆی ئەو بابەت و هەلومەرجانەی کە دێنە پێشی مرۆڤ و بەهەڵەیدا دەبەن.

سەبارەت بە درۆکردنیش؛ ئەمیش خاوەنەکەی ڕاپێچی سەرکەشی و گوناه و تاوان دەکات، کە دیسان ئەویش خاوەنەکەی پەلکێشی دۆزەخ دەکات. مرۆڤ کاتێک درۆکردن وەك هۆکارێك بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی و داپۆشینی هەڵە و کەموکورییەکانی بەکاردەهێنێت، ئەوا خۆی دەخاتە بەر مەترسیی چوونە نێو ڕیزی سەرکەش و یاخیبوانەوە، دیارە یاخیبوانیش ئەو کەسانەن کە بە ئەنقەست درۆ و تاوان دەکەن، هەوڵدەدەن بەتاڵ و ناڕەوا بە هەق و ڕەوا و، هەق و ڕەواش بە بەتاڵ و ناڕەوا بناسێنن، بێ ئەوەی شەرم لە خوا و لە بەندەکانیشی بکەن.

ئێمە لە نێو خێزانەکاندا سەرەتا پێویستمان بە ڕاستگۆیی گەورەکان دەبێت، تاوەکو بچووکەکان گەورەیی ڕاستگۆیی و مەترسی درۆکردنیان بۆ دەربکەوێت، بۆیە جێگەی خۆیەتی لە کاتی گفتوگۆکانماندا زۆر ورد و ڕاستبێژبین، بەتایبەتیش لە کاتی هەڵچوون و تووڕەبووندا، هەروەها لەو کاتانەی بەڵێن بە منداڵەکانمان دەدەین دەبێت بیبەینەسەر، ئەگینا منداڵ نەبردنەسەری بەڵێن بە شتێکی ئاسایی وەردەگرێت. یەکێك لە خێزانە موسوڵمانەکان گفتوگۆیەکی خۆشی لەبارەی ڕاستگۆیی و درۆکردنەوە سازدا؛ لەو قسانەی کە باوکیان کردنی: "ئەگەر کەسێکمان وتی فلانە کەس گەشتی کردووە،

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ئەو کەسەمان بە تەواوی لەوە دڵنیا بووەتەوە کە ئەو کەسە گەشتی کردووە، خۆ ئەگەر ئەو کەسە دڵنیا نەبوو، ئەوا با بڵێت: بیستوومە گەشتی کردووە، یان پێم وابێت گەشتی کردووە، کەوابوو پێویستە قسە و دەربڕینی مرۆڤ وردەکاریی تێدا بێت".

لێرەدا یەکێك لە کچەکان هاتە دەنگ و وتی: ئەگەر وتم گەشتی کردووە و دڵنیاش بووم لە قسەکەم، بەڵام دوایی دەرکەوت کە وا نییە، ئایا ئەوە بە درۆ لەقەڵەم دەدرێت؟ باوکی وتی: "ئەوە بە درۆ لەقەڵەم نادرێت مادام نیەتی درۆکردنت نەبووە، بەڵام نەچوونەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تۆ خەیاڵت کردووەتەوە یان پشتت بە سەرچاوەیەکی بڕواپێنەکراو بەستووە، پێویستیشە موسوڵمان بەر لەوەی قسەیەك لە زاری بێتە دەرەوە بە تەواوی دڵنیاببێتەوە"، یەکێك لە منداڵە بچووکەکان دەستی بەرز کردەوە و وتی: "ئاخر ئەگەر ڕاستییەکە بە دایکم بڵێم ئەوا لێم دەدا، منیش ڕقم لە لێدانە، بۆیە ناچارم درۆی لەگەڵدا بکەم، بەڵام دوای ماوەیەك کە لە ئامێزم دەگرێت ڕاستییەکەی پێدەڵێم!!" دایکە لێرەدا زەردەخەنە کەوتە سەر لێوانی و وتی: "ئەی فێڵزان ئاشکرابووی، جارێکی تر لە دەستم دەرناچیت".

پاشان خێزانەکە لەسەر شتێکی جوان ڕێککەوتن، ئەویش ئەوەبوو هەر کەسێك هەڵەیەکی ئەنجامدا، یان کەمتەرخەمییەکی لێوەشایەوە، ئەوا بۆ ئەوەی سزا نەدرێت دەبێت دان بە هەڵەکەیدا

بنێت و، بەڵێن بدات جارێکی دیکە نەگەڕێتەوە سەری، دایکە وتی: "ئەی ئەگەر دووبارەی کردەوە؟" باوکە وتی: "ئەوسا ئیتر سزا دەدرێت ئەگەرچیش ڕاستییەکەی بڵێت، ئەگەریش درۆی کرد، ئەوا سزاکەی بە دووبەرانبەر بەسەردا جێبەجێدەکرێت"، کچێکی بچکۆلانەیان وتی: "سزا قەیناکە، بەڵام با لێدانی تێدا نەبێت"، هەموویان دایانە قاقای پێکەنین و کۆتاییان بە دانیشتنەکە هێنا دوای ئەوەی کە لەسەر ئەوە ڕێککەوتن.

## ٥- سووربین لەسەر کاسبی حەڵاڵ:

لەم سەردەمەی ئێستاماندا بەرژەوەندییەکان ئاڵۆز بوون و شێوازەکانی مامەڵەکان و ڕێگاکانی کاسبی کردن و کۆکردنەوەی داهاتیش زۆر بوون، جا لەبەر ئەوەی زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی ئابووری جیهانیان بەدەستەوەیە و، دارێژەری یاساکانی کار و مامەڵ دراوییەکانن کەسانێکی دوور لە ئاینی ئیسلامن و، گوێ بە یاساکان شەریعەتی ئیسلام لە مەسەلەی کاسبی و پارەپەیداکردن دەستکەوتەکاندا نادەن، بۆیە دەبینیت زۆربەی سەرچاوەکان پارەپەیداکردن باوەڕپێنەکراون یاخود گومانی خراپیان لێدەکرێ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَ رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُواْ لِلّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ البقرة: ١٧٢، واتە: (ئ ئەوانەی ئیمانتان بە خودا و پێغەمبەری خودا هەیە لەو ڕزق و ڕۆزی

پاکانە بخۆن کە پێمان بەخشیون و، ئەگەر خودا دەپەرستن سوپاسی بکەن).

وشەی (طیب) لێرەدا بە واتای حەڵاڵ دێت کە خاوەنەکەی لە ڕێگەی دروستەوە بەدەستی دەهێنێت.

ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) لە زاری پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلى السَّمَاءِ: يَا رَبِّ يَا رَبِّ، وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسَهُ حَرَامٌ وَمَشْرَبُهُ حَرامٌ، وَغُذِيَ بِالْحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ))[1] واتە: ((هەندێ کەس دەچن بۆ سەفەری دووردرێژ، وەك حەج و غەزا، جا قژیان گف دەبێت و چڵك و تەپوتۆزیان لێ دەنیشێت و سەرگەرمی بەندەیی خودان و بەکوڵ و دڵ دەست درێژ دەکەن بەرەو ئاسمان کە قیبلەگای نزا و پاڕانەوەیە و دەڵێت: خودایە! ئەوەم پێ بدە، خودایە! لەو دەرد و بەڵایە لام بدە، ئەو خواردنەکەی حەرامە، خواردنەوەکەی حەرامە، بە حەرام گۆش کراوە، ئیتر لە کوێ دوعا و نزای ئەو جۆرە کەسەیە گیرا دەبێت)).

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە نزا و پاڕانەوەی کەسێك وەرناگرێت کە خواردن و خواردنەوەی حەرام بێت، هەروەها دەڵێت: خوای گەورە کار و کردەوەشی وەرناگرێت؛ موجاهید لە ئیبن عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: ((لا یقبل

---

١- موسلیم: ١٠١٥

الله صلاة امرئ في جوفه حرام)) واته: ((خودا نوێژی كەسێك وەرناگرێت كە حەرامخۆر بێت))[1]

هەروەها پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: ((مَا تَصَدَّقَ أَحَدٌ بِصَدَقَةٍ مِنْ طَيِّبٍ –وَلاَ يَقبَلُ اللهُ إلاّ الطَّيِّبَ– إلاّ أَخَذَهَا الرَّحْمَنُ بِيَمِينِهِ))[2]. واتە: ((خوای گەورە ئەوەی پاك و پوخت نەبێت قبوولی نافەرموێت، لەبەرئەوە هەریەكێك صەدەقەیەك ببەخشێت لە ماڵێكی بێ گەرد و حەڵاڵ، ئەوا خوای میهرەبان و مەزن بە ڕاستەی خۆی لێی قبووڵ دەفەرموێت.))

ئافرەتێك براكەی بۆی گێڕایەوە كە مێردەكەی مامەڵەی خەڵكی بەڕێ ناكات تا بەرتیلیان لێوەرنەگرێت، بە بیستنی ئەو هەواڵە زۆر بێزار و ناڕەحەت بوو، چونكە بۆی ڕوونبووەوە كە ئەو پۆشاكانەی خۆی و منداڵەكانی لەبەریان دەكەن و، ئەو پارەو نان و خواردنەی كە دەچێتە گەروویانەوە بە پارەی حەرام كڕاوە، بۆیە دوای ئەوەی باسەكەی لا ورووژاند، مێردەكەی دانی بە ڕاستیەكەدا نا و، بەرزی نرخی كاڵاكان و زۆریی خەرجیی خێزانەكە و كەمی مووچەكەی وەك پاساوێك بۆ ئەو ڕەفتارەی هێنایەوە. ئافرەتەكە وازی نەهێنا و لەگەڵ كوڕە گەورەكەیدا دانیشت و باسەكەی لا دركاند و، بۆ بەرگرتن لەو

---

١– رواه مسلم وغيره.

٢– بوخاری: ١٣٤٤، موسلیم: ١٠١٤

کارە تاوتوێی چەند شتێکیان کرد و بڕیاریاندا چەند هەنگاوێکی بۆ بگرنەبەر، لەوانە:

- بەهۆی مەترسیی بابەتەکەوە؛ لە نزیکەوە ئاگاداری بن و بەدواداچوونی بۆ بکەن.
- ڕێککەوتن لەگەڵ سەرگەورەی ماڵ (کە باوکیانە) لەسەر ئەوەی بە یەکجاری واز لە بەرتیل وەرگرتن بهێنێت.
- دایکەکە دەست بە خەرجییەکانی ماڵەوە بگرێت و، کڕینی ئەو شتانەش دوا بخات کە پێویست نین.
- لە کاتی پشووی هاویناندا منداڵە گەورەکان چەند ئیشێکی گونجاو بکەن تاوەکو خەرجییەکانی ساڵی نوێی خوێندنیانی پێ دابین بکەن.
- کچە تاقانەکەشیان لەگەڵ کۆمپانیایەکدا ڕێکبکەوێت کە هەر لە ماڵەوە ئیشێکیان بۆ ڕاپەڕێنێت.

ئافرەت ویژدانی خێزان و، ویژدانی نەتەوەشە، بۆیە ئێمەش زۆر خەمی پاك و بێگەردبوون و چاودێریکردنی ئایین و خێزانەکەشی لەم بارەیەوە دەخۆین.

## ٦- سازش لەسەر بیروباوەڕ و کەرامەتمان ناکەین:

ئەم سەردەمەی تێیدا دەژین سەردەمی سازشکردنە، دەبینین جیهانگەرایی خەڵکیی بەجۆرێك فێری تەماع و بەرژەوەندیخوازیی کرد

کە لەوەپێش وێنەی نەبووە، بۆیە بۆ بەدەستهێنانی ڕێژەیەکی زۆرتری بەرژەوەندییە مادییەکان وای لێهاتووە سازش و دانوستاندن لەسەر هەموو شتێك دەکرێت.

جا دەستگرتن بە بنەما و بیروباوەڕەوە مەرجێکی سەرەکیی دامەزراوی و بەلاڕێدا نەچوون و مانەوەیە لەسەر ڕاستەشەقام، ئەوەتا خوای گەورە لە ئایەتێکدا ئامۆژگاری پێغەمبەر دەکات کە لەوە لانەدات: ﴿فَاسْتَمْسِكْ بِالَّذِي أُوحِيَ إِلَيْكَ إِنَّكَ عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ الزخرف : ٤٣. واتە: (دەی تۆ توند دەست بەو شتەوە بگرە کە بە وەحی هاتووەتە خوارەوە بۆت کە قورئانە، تۆ بێ گومان لەسەر ڕێگایەکی ڕاستی) .

لە ڕاستیدا بەها و کرۆکی دینداری و خواناسی لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە بتوانین قوربانی لە پێناودا بدەین تا ڕووسووری لای خوا بین، بەڵام کاتێك مرۆڤ بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندییەکانی ئامادەیە سازش لەسەر هەندێ لەو شتانە بکات کە بڕوای پێیانە، ئەوا بزانە کە دەشێت زۆرێك لەو بەها و کرۆکەی لەدەستدابێت. ئەگەر توانیمان منداڵەکانمان لەسەر بنەمایەك پەروەردە بکەین کە دەڵێت: (خوا ڕۆزیدەرە) و، بنەمایەك کە دەڵێت: (تەمەن و ڕزق و ڕۆزی بەدەستی خوایە) و، بنەمایەك کە دەڵێت: (خوا ڕزق و ڕۆزی لە کەسێك بگرێتەوە، کەس ناتوانێت پێی ببەخشێت، بشیەوێت ڕزق و ڕۆزی بەکەسێك ببەخشێت، کەس ناتوانێت لێی بگرێتەوە)، یان

بنەمای (هەر کەس لەبەر خاتری خوا دەست لە شتێك یان لە کارێك هەڵبگرێت، ئەوا خوای گەورە بە شتێکی چاکتر پاداشتی دەداتەوە و بۆی قەرەبوو دەکاتەوە)، ئەوا هەرگیز پەنا بۆ بەرتیل خواردن نابەن و، سووکایەتی لە کەس قبوڵ ناکەن و، پیلان لە دژی هاوڕێکانیان ناگێڕن و، سەریشیان بۆ کەس شۆڕ ناکەن... بۆچی؟ چونکە بیروباوەڕەکەیان ڕێگرییان لێدەکات کە کاری وا ئەنجام بدەن، بۆیە هەر کات بینیمان منداڵەکانمان بەلایانەوە ئاساییە کاری وا ئەنجام بدەن، مانای وایە بەپێی پێویست نەمانتوانیوە پەروەردەیەکی ڕاست و دروستیان بکەین. ئەو کەسەی دەست بە بیروباوەڕ و بەهاکانییەوە دەگرێت و، خەمی ڕێز و کەرامەتی خۆی دەخوات، ڕەنگە ماوەیەك چەند شتێك لەدەستبدات، بەڵام هەتا هەتایە براوەیە، بێگومان قەیران و کێشە و ناڕەحەتییەکانیش تاقیکردنەوەیەکن بۆ پەیامدارەکان، جا بۆ ئەوەی پەیامەکەیان سەنگین و جێگەی شانازی بێت، دەبێت ئامادەییان تێدا بێت قوربانی لە پێناودا بدەن؛ دەنا ئەو پەیامە تێدا دەچێت و، ئەوانیش لەگەڵ خۆیدا پەلکێش دەکات!

کوڕێك دەردەدڵی خۆی لەسەر دەزگایەکی خێرخوازی بۆ باوکی باسکرد، دیاربوو ستەمی لێکرابوو و ناڕوونییەك لە گرێبەستەکەی نێوانیاندا بەدی دەکرا، باوکی پێی وت: باسی بابەتەکەیان لە لا بکە و، کێشەکەتیان بۆ ڕوونبکەرەوە، کوڕەش لە وەڵامی باوکیدا وتی: "بیروباوەڕ و کەرامەتم ڕێگەم پێنادات قسە لەسەر وەها بابەتێك

بکەم"، باوکی وتی: "ئۆخەی! ئا ئێستا ئیتر دڵم ئاوی خواردەوە و، بۆم دەرکەوت کە ئەو ڕەنجەی لە پەروەردەکردنتدا لەگەڵتم کێشاوە بەفیڕۆ نەچووە و بەرهەمی هەبووە". چەندین لاوی خوێنگەرم هەن کار و پیشەی ناوداریان پێشکەش کراوە، بەڵام لەبەر ترسی زیانگەیاندن بە بیروباوەڕ و ڕەوشتیان ڕەتیان کردووەتەوە و، بە شتی زۆر لەوە کەمتر ڕازیبوون تاوەکو بیروباوەڕ و پەیامدارییەکەیان ڕووبەڕووی مەترسیی نەکەنەوە.

**پابەندبوون بە بیروباوەڕەوە لای خێزانی موسوڵمان بریتییە لە:**

- بڕوامان وابێت کە لەم دونیایەدا هەموو شتێکمان دەست ناکەوێت، بۆیە پێویستە دەست لە شتانێك هەڵگرین تاوەکو بیروباوەڕ و کەرامەتمان لە کیس نەچێت.
- هەموو شتێك باجی دەوێت، جا ئەگەر بمانەوێت چێژ لە هەموو خۆشییەکانی ژیان وەربگرین، مانای وایە دەبێت سازش لەسەر هەندێك لە بیروباوەڕ و قەناعەتەکانمان بکەین، ئەوەش جێگەی قبوڵکردن نییە.
- ئەندامانی خێزان هانی یەکتری بدەن بۆ ئارامگرتن و ڕووبەڕووبوونەوەی هەوەس و ئارەزووەکان.
- یادخستنەوەی بەردەوامی ئەندامانی خێزان، بەوەی کە وریای سازشکردن بن لەسەر ئەو بابەتانەی سازشیان لەسەر ناکرێت.

• هەموو ئەو تاوان و هەڵانەی دەکرێن، لە خۆشویستنی دونیاوە سەرچاوە دەگرن، بۆیە لەسەر خێزانی موسوڵمان پێویستە ئاگای لەوە بێت و، جەخت بکاتەوە لەسەر ئەوەی کە ژیانی ڕاستەقینە ژیانی دوارۆژە.

## ٧- لە ئاست ستەمکارییدا بێدەنگ نابین:

ئەمە بەهایەکی گرنگە بۆ چەسپاندنی دادگەریی، بێگومان دادگەریش یەکێکە لە هەرە مەزنترین ئەو بەهایانەی کە ژیانی خێزان و کۆمەڵگەکانی سەرتاسەری جیهانی پێوە بەندە، گەر بێین و ئاماژە بە تەواوی ئەو ئایەت و فەرموودانە بکەین کە هۆشداری دەدەن دەربارەی ستەم و، مەترسییەکانی دەخەنەڕوو، ئەوا کاتی زۆرمان لێدەبات، با ئەم چەند ئایەت و فەرموودە بەس بێت:

﴿وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلّهِ جَمِيعاً وَأَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ﴾ البقرة: ١٦٥، واتە: (جا ئەگەر ئەم ستەمکارانە کە هاوڕێیان بۆ خودا داناوە. ڕۆژی سزایان دەدی بۆیان ڕوون دەبووییەوە و زۆر باش دەیانزانی هەموو هێز و توانێ هەر هی خودایە و، خودا سزای توند و تۆڵەی سەختی هەیە.) یان دەفەرموێت: ﴿وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ﴾ الشعراء: ٢٢٧. واتە: (بێگومانیش ستەمکاران لە دوارۆژا دەزانن چۆن هەڵگەڕانەوەیەک هەڵدەگەڕێنەوە و چۆن پشتیان دەشکێت). یان دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لَافْتَدَوْا بِهِ مِن سُوءِ الْعَذَابِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

﴿وَبَدَا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ﴾ الزمر: ٤٧. واتـه: (ئەگـەر ئەوانەی لە دنیادا ستەمکار بوون هەرچی دارایی و سامان لـە زەویدا هەیە هیی ئەوان بوایە و ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بوایـە دەیانکرد بـە قوربانی خۆیان و دەیاندا لەباتیی ئەوەدا لەو سزا سەختە ڕزگارببن کە لە ڕۆژی قیامەتدا تووشیان دەبێت و، لەو ڕۆژەدا بۆیـان دەردەکەوێت لەلایـەن خـواوە لـە ئـازار و سـزا، ئـەوەی کـە هـەر بـە خەیاڵیشیاندا نەدەهات.)

پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفـەرموێت: ((اتَّقُوا الظُّلْمَ، فإنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ القِيَامَةِ...))[١] واتـه: ((خۆتـان لـە زۆر و ستەم بپارێزن، بەڕاستی زۆر و ستەم تـەم و تـاریکی زۆرن لـە ڕۆژی قیامەتا و زۆردارەکـە دەکەوێتـە ناویـان و وەك کـوێری موزمـەعیل بـە هیچ لایەکا سەردەرناکا...))، یـان دەفـەرموێت: ((لَتُؤَدُّنَّ الْحُقُوقَ إلى أَهْلِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، حَتَّى يُقَادَ لِلشَّاةِ الْجَلْحَاءِ مِنَ الشَّاةِ الْقَرْنَاءِ)).[٢] واته: ((لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو خاوەن مافێك مـافی خـۆی وەردەگرێت و مافی کەس لە کەس نامێنێت، تەنانـەت بزنـی کـۆڵ لـە بزنـی شـاخدار دەسەنرێت بۆی!))، یـان دەفـەرموێت: ((إِنَّ اللهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ؛ فَإِذا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ...))[٣] واته: ((لەڕاستیدا خودا مۆڵەتی پیاوی زۆردار و

---

١- موسلیم: ٢٥٧٨

٢- موسلیم: ٢٥٨٢

٣- بوخاری: ٤٦٨٦، موسلیم: ٢٥٨٣

ستەمكار دەدات و تا ماوەیێ جڵەوی بۆ شل دەكات، هەتا بزانێت پەشیمان دەبێتەوە یان نا، بەڵام كاتێك قورتمی دەگرێت ئیتر قوتاری نابێت!)) ئینجا بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَىٰ وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ هود: ١٠٢ واتە: (خودا كە غەزەب لە دێهاتە ستەمكارەكان دەگرێت ئاوەها غەزەبیان لێ دەگرێت و لەناویان دەبات. بەڕاستی غەزەبی خودا ئازاردار و سەختە و ڕزگاربوون لێی مەحاڵە).

دەتوانم بە دڵنیاییەوە ئەوە بڵێم كە: هیچ شتێك هێندەی ستەمكاری و جیاوازیكردن لە خۆشویستنی منداڵان زیان بە پەیوەندی نێوان تاكەكانی هەر خێزانێك نادات، بۆیە گەر بمانەوێت ڕاستگۆیانە بدوێین، ئەوا دەبێت بڵێین:

ماڵی چەندەها موسوڵمان پڕن لە ستەم و نادادی، هی وا هەیە ڕێزی هاوسەری یەكەمی و منداڵەكانی بەسەر هاوسەری دووەمی و منداڵەكانیدا دەدات، هەشە بە پێچەوانەوە، ماڵی واش هەیە كوڕیان بەلاوە باشترە لە كچ، ماڵی واش هەیە هەموو منداڵەكانیان كردووەتە قوربانی منداڵێكیان و چەندانی تر... سەرم سووڕماوە لە كەسێك كە لەگەڵ كوڕەكانیدا خەریكە پلان بۆ بێبەشكردنی كچەكانی لە میرات دادەڕێژێت! باشە ئەو كەسە لە خوا ناترسێت، ئەی كە مرد چی وەڵامی خوا دەداتەوە، ئەمە جۆرێكی سەیرە لە گەمژەیی و زیان لە

خۆدان، کەسانێك چێژ لە شتانێك وەربگرن کە شایستەی نین و، پیاوێکیش خۆی بەر خەشم و قینی خوا بخات و بەو حاڵەشەوە سەر بنێتەوە، ئای! چەند ئازار دەچێژم کاتێك دەبیستم کچێك دوعا لە باوکی دەکات کە بێبەشی کردووە لە میرات و، دەڵێت: لە خوا داواکارم بێبەشی بکات لە بەهەشت وەك چۆن منی بێبەشکرد لە میرات!!

بێدەنگی زۆرێك لە خەڵکی لە ستەم و ستەمکاریی ڕێخۆشکەرێکە بۆ ستەمکاران کە بەردەوام بن لەسەر ئەو کارەیان، بۆیە دژایەتیکردنی ستەمکاران و پاڵپشتیکردنی ستەملێکراوان یەکێکە لە ئەرکە مەزنەکانی موسوڵمان لەم ژیانەدا؛ چونکە ستەم ئەگەر تەشەنەی سەند هەموو شتێك تێکدەدات و، سەراپای ژیانی خەڵك دەکاتە دۆزەخ، ئەها پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: ((انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِماً أَوْ مَظْلُوماً، فقال رجل: يا رسول الله انْصُرُهُ إذا كانَ مَظْلوماً، أرأيتَ إنْ كانَ ظالماً فكيف أنصُرهُ؟ قالَ: تُحْجِزُهُ أوْ تَمْنَعُهُ من الظُّلمِ فإنَّ ذلك نصرُهُ))[1]. واتە: ((یاریدەی برای خۆت بدە، لەسەر هەق بێت یان لەسەر ناهەق بێت! پیاوێکیش وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر لەسەر هەق بێت ئەوا جێگەی خۆیەتی یارمەتی دەدەم، وەلێ پێم بفەرموو ئەگەر لەسەر ناهەق بوو چۆن

---

١- بوخاری: ٢٤٤٣.

چۆنی یارمەتی بدەم؟ فەرمووی: مەیەڵە ئەو ناهەقییە بکات ئەوە باشترین یارمەتییە بۆی!)).

ژن و مێرد و منداڵەکانیان بە کچ و کوڕەوە، بەرپرسیارێتی چەسپاندنی دادگەرییان لە ناو خێزاندا دەکەوێتە ئەستۆ، وەك لە فەرموودەکەشەوە ڕوونبووەوە ئەمەش بە جەختکردنەوە لە کاری دادگەری و ویژدان خستنەکار و گێڕانەوەی مافی خەڵك و، دژایەتیکردنی ستەمی نێو خێزان و، دەربڕینی هاوسۆزی بۆ ستەملێکراو و دڵدانەوەی و، کارکردن بۆ سەندنەوەی مافی زەوتکراوی؛ دێتەدی.

ستەم لەناو کۆمەڵگەدا تەشەنە دەسێنێت، چونکە لەناو خێزاندا بەری پێنەگیراوە، هەروەها زۆربەی خەڵکی کاتێك تەمەنیان گەورە دەبێت ستەم لە خەڵکی دەکەن تاوەکو تۆڵە لەو کۆمەڵگەیە بکەنەوە کە لە کاتی تەنگانە و چەوساندنەوەیاندا بەدەمیانەوە نەچووە.

خوای گەورە داوای ئەوەمان لێناکات بە یەکسانی منداڵەکانمان خۆش بوێن، چونکە ئەوە لە سەروو تواناوەیە، بەڵام داوای ئەوەمان لێدەکات کە وریابین ئارەزوو و خواستی دڵمان تێکەڵ بە ڕەفتارو مامەڵە و پەیوەندییەکانمان نەبێت.

دادگەریی نێوان منداڵەکانیش مانای یەکسانیبوون لە هەموو شتێکدا ناگەیەنێت، بۆ نموونە ئەگەر هاتوو منداڵێکمان بە تەمای درێژەدان بوو بە خوێندنەکەی، ئەوا ئێمە دەستگیرۆیی دەکەین، ئێمە

مەرج نییە ئەو پارەیەی بەمی خوێندکارمان داوە بیدەین بە برایەکی تری کە خوێندکار نییە و ئیش دەکات یاخود لە شوێنێکدا فەرمانبەرە، بەڵام دەبێت کەشێکی ئارام و لێکتێگەیشتن لە وەها حاڵەتێکدا بسازێنین، ئەگەر هاتوو ئەو منداڵەشیان کە پیشەیەکی پێ لە کاری خوێندکاریی پێ باشتر بووە پێویستی بە هاوکارییەك بوو، ئەوەی کە لەدەستمان بێت بۆی دەکەین، ئەڵبەت ئەم بابەتەش ئاو زۆر دەکێشێت و پێم خۆش نییە ئێستا باسی لێوە بکەین.

باوکێکی دەوڵەمەند ئۆتۆمبێلێکی گرانبەهای بۆ کوڕە گەورەکەی کە سێیەمساڵی خوێندنی زانکۆی بوو کڕی، هەروەها ئۆتۆمبێلێکی سادەی بۆ ئەو کوڕەی تری کە لە قۆناغی یەکەمی زانکۆدا بوو کڕی، ئەو حاڵەتە لێکدانەوەی هەڵەی لە دڵ و دەروونی کوڕە بچووکەکەیان دروستکرد و بە ستەمێکی گەورەی زانی، ئەو کچەشیان کە لە قۆناغی ئامادەییدا دەیخوێند هەستی بەوە کرد و، باوکیشی لەو بارەیەوە دواند، لە وەڵامدا باوکی زۆر سوپاسی کرد و، وتی: "ئاساییە کە ئۆتۆمبێلی کوڕە گەورەکە گرانبەهاتر بێت"، کچەکەش وتی: "منیش کێشەیەك لە جیاوازییکردندا نابینم، بەڵام بەهای ئۆتۆمبێلەکەی ئەو - کە ئەویش خوێندکاری زانکۆیە - دەفتەرێکە و هی برا بچووکەکەشی بیست گەڵایە جیاوازییەکی هێجگار زۆرە باوکە! لێت شاراوە نەبێت براکەم هەست دەکات ستەمی لێکراوە و، خەریکە ڕقیشی لە برا گەورەکەی دەبێتەوە، بۆیە باش وایە چارەسەرێکی ئەم کێشەیە

بکەین"، باوکە زۆر دڵخۆش و سەرسام بوو بە پێشنیاری کچەکەی و، دەستبەجێ کەوتە چارەسەری ڕەوشەکە و، تەواوی ئەندامانی خێزانەکەی ئاسوودە کرد.

لە خانەوادەیەکی تردا دایکە سەرنجی بۆ ئەوە چوو کە مێردەکەی پارەیەکی زۆر بۆ (ساکار)ی کچی - کە خوێندکاری قۆناغی ئامادەییە- خەرج دەکات، بە پاساوی ئەوەی کە کچێکی سەلار و ئیشکەرە و لە خزمەتی باوکیایەتی و، زیرەك و سەرکەوتووشە لە خوێندنەکەیدا.. کەچی لەگەڵ (مەحمود)ی کوڕیدا - کە سێ ساڵ لەویش گەورەتر بوو - هەڵوێستێکی تەواو جیاوازی هەبوو، بەردەوام هەڕەشە و گوڕەشەی لێدەکرد، هەر هەڵەیەکیشی لێبوەشایەتەوە سزایەکی توندی دەدا، ئەمەش وایکرد ڕقی لە خوشکەکەی ببێتەوە و سزای بدات و، بێبەشی بکات لە زۆر شت لە کاتی ئامادەنەبوونی باوکیدا، ڕۆژێکیان دایکیان مێردەکەی و کوڕە گەورەکەی دواند و، ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە باوکە دەست لەو هەموو خەرجیەی کە بۆ کچەکەی دەکات بگرێتەوە و، دەست لەو هەڕەشە و گوڕەشانەش هەڵگرێت کە بەرامبەر بە کوڕەکە ئەنجامیان دەدات، هاوکات دایکەکە و کوڕەگەورەکەش پێکەوە هانی مەحمود بدەن و لە چەند شتێکیشدا هاوکاریی بکەن.

کچانێکی نۆر بە بیانووی بێزهاتنەوەیان لە پیاوان چەندین خوازبێنیکەری باشیان ڕەتکردووەتەوە، ئەڵبەت ئەو ڕقی د

بێزهاتنەوەیان لەو ستەم و نادادییەی باوکیان لەگەڵ دایکیان هەیبووە بۆ ماوەتەوە، ئەمە خەمی ئەوەی لا دروستکردوون کە ئەزموونی تاڵی دایکیان لەگەڵ ئەمانیش دووبارە ببێتەوە، جا تەماشای شوێنەواری ستەم و نادادی بکە کە چۆن دەشێت پشتاوپشت درێژە بکێشێت و بمێنێتەوە!

ئەرکی سەرشانی هەموومانە بە شێوازی شیاو و دانایانە و ژیرانە بەرەنگاری ستەمکار - بەبێ جیاوازی - ببینەوە، خوای گەورەش پاداشتی چاکەکاران دەداتەوە.

## ٨- ڕێزی یاسا بگرین:

خەڵکی ئارەزووی بێسەروبەریی دەکەن و، ڕقیان لە پەیڕەوکردنی یاسا و ڕێساکانە؛ چونکە پێیان وایە کە بێسەروبەریی سەربەستییە، یاخود نیمچەسەربەستییەکە، ئێمەش پێمان وایە کە پەیوەندییەکی تۆکمە لە نێوان بێسەروبەریی و دواکەوتووییدا هەیە و، زۆربەی شارستانێتی گەلانیش بۆ ڕێکخستنی کاروباری گشتی و تایبەتیی ژیانیان دەگەڕێتەوە. منداڵە بچووکەکان ئەم شتانە نازانن، چونکە گوێیان لە کات و قازانج و زیان و کار و چالاکی نییە، بەڵام خۆ گەورەکان دەزانن کە ژیانی ڕێکنەخراو و بێ یاسا سەختە و پڕە لە گێرە و کێشە.

بیهێننە پێش چاوی خۆتان کەوا شارێکی تەنراو بە خەڵك و ئۆتۆمبێل، هێماکانی هاتووچۆ و، پۆلیسی هاتووچۆی تێدا نەبێت، دەبێت حاڵی چۆن بێت؟

بێگومان هەمووان بەهۆی پێکدادانەوە زەرەرمەند دەبن و، شەڕ و ئاژاوەی زۆریشی لێدەکەوێتەوە، ئاکامەکەی سستی جوولەی لێدەکەوێتەوە. دەی ژیانی ئێمەش وایە، بەبێ یاسا کێشە و گرفتی زۆری لێدەکەوێتەوە و، دواجار جموجووڵیشمان سست دەبێت.

پەرستشەکان لە ئیسلامدا جەخت لەسەر چەمکی یاسا و ڕێساکان دەکەنەوە، تەماشا دەکەیت کە هەموو پەرستشێك کاتێکی دیاریکراوی هەیە، بۆیە پێویستە لەوەوە فێری ڕێکخستنی کاروبارەکانمان ببین، بە بڕوای من ئەوەی پێویستی بە ڕێکخستن بێت لە نێو خێزاندا ئەمانەی خوارەوەن:

- کاتەکانی نانخواردن.
- کاتەکانی نووستن و لەخەوهەستان.
- دابەشکردنی ئیش و کارەکانی ماڵ بەسەر منداڵەکاندا.
- کاتەکانی سەعیکردن و نووسینەوەی ئەرکەکانی ماڵەوە.
- سەیرکردنی تەلەفیزیۆن و بەرنامە هەمەڕەنگەکان[1].
- کۆبوونەوەی هەفتانە یان مانگانە کە تەواوی ئەندامانی خێزانی تێدا کۆدەبنەوە بۆ ڕێکخستنەوەی کارەکانیان.

---

١- بەکارهێنانی ئینتەرنێت و فەیسبووك. (وەرگێڕ)

• گەشت و سەیران بۆ هاوینەهەوار و شاری یارییەکان.
• بەسەرکردنەوەی کەسوکار و خزمان.

ڕێککەوتنی دایك و باوك لەسەر ئەو خاڵانەی ئاماژەمان پێدان بۆ سەروەریی یاسا لە ناو خێزاندا پێویستە ، گەر سەرنجێك لە خێزانە لێکترازاو و لەبەریەکهەڵوەشاوەکان بدەین، دەبینین کە بەهەندوەرنەگرتنی یاسای نێو خێزان لە لایەن دایك و باوکەوە و ڕێکنەکەوتنیان لەسەر خاڵە سەرەکییەکانی ئەو یاسایە، بوونەتە هۆکاری لەدەستدانی گیانی هەرەوەزی و، تەشەنەسەندنی بێسەروبەری تێیدا.

## ٩- زمان هێمای پێشکەوتنە:

زۆربەی خەڵکی بێئاگان لە کاریگەرییە گەورەکانی زمان لەسەر هزر و هەستەکان، ئەوەی ئێمە لێی تێگەیشتووین ئەوەیە کە زمان هۆکارێکە بۆ گوزارشتکردن لە بیروبۆچوون و هزر و هەستەکانمان، کە بێگومان هەرواشە.. بەڵام ئەوەی پێویستە ئاگاداری بین ئەوەیە کە لە کاتی بیرکردنەوە و تێڕاماندا بیر لەو وشە و ڕستانە بکەینەوە کە دەریان دەبڕین؛ چونکە ئەو قسانەی دەیانکەین، ڕەنگدانەوەی بیرکردنەوەکانمانن، کە دواجاریش دەبنە خوو تیاماندا.

ئەوەتا خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە کە کەسانێك هەن قسەکانمان تۆمار دەکەن، تاوەکو دواتر لەسەریان لێپرسینەوەمان

لەگەڵدا بکرێت، وەك دەفەرموێت: ﴿مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق : ١٨. واتە: (ئادەمزاد قسەیێ چییە نایکا ئیللا فریشتەیەکی چاودێریکەری ئامادە بۆ نووسینی لەلاوەیە هەرچیی بەدەما بێ هەمووی لای خۆی دەنووسێت).

پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لەسەر بێت) ئاگاداری کردووینەتەوە لەوەی کە دوور نییە قسەیەك ببێتە مایەی خۆشبەختی یان بەدبەختی مرۆڤ، وەك دەفەرموێت: ((إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللهِ - تعالى - ما كان يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ ما بَلَغَتْ، يَكْتُبُ الله لَهُ بِهَا رِضْوَانَهُ إلى يَوْمِ يَلْقَاهُ، إِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ الله مَا كَانَ يَظُنُّ أَنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغَتْ، يَكْتُبُ اللهُ لَهُ بِها سَخَطَهُ إلى يَوْمِ يَلْقَاهُ)).[١]

واتە: (( وا دەبێت پیاوێك وتەیەك دەڵێت: دەبێت بەهۆی ڕەزامەندی خودای گەورە، خەیاڵی لای ئەوە نەبووە کە ئەو وتەیە بگاتە ئەو پایە باشەی کە دەیگاتێ، جا خوای گەورە بەهۆی ئەو وتەیەوە ڕەزامەندی خۆی بۆ دەنووسێت و ئیتر لێی ناڕەنجێت تا ئەو ڕۆژەی دەگاتەوە بە دیداری خودا، هەروەها وا دەبێت پیاوێك وشەیەك لە دەمی دەردەچێت دەبێت بەهۆی ڕەنجاندنی خودا، خەیاڵی لای ئەوە نەبووە کە ئەو وشەیە بگاتە ئەو پایە خراپە کە دەیگاتێ، جا خودای گەورە بەهۆی ئەو وشەیەوە ناڕەزایی خۆی بۆ

١- تیرمیذی: ٢٣٢٠

دەنووسێت و ئیتر لێی ڕازی نابێت تا ئەو ڕۆژەی دەچێتەوە بەردەستی خودا)).

نامەوێت لێرەدا لەوە زیاتر چەند دەقێکی دیکەی تایبەت بە پاراستنی زمان و، دەربڕینی جوانتان بۆ بهێنمەوە، چونکە بەڕاستی زۆر زۆرن.

مرۆڤ تا نەکەوێتە قسە ناناسرێت، هەربۆیە ئەو شێوازی قسەکردنەی کە ئەندامانی خێزان پەیڕەوی دەکەن گوزارشت لە دینداری و ڕەوشتبەرزی و هۆشیاری و ئاستی ڕۆشنبیری و تێگەیشتنیان دەکات و، چەندین خاڵی سەرەکیمان هەن کە هۆکارێکن بۆ بەرەوپێشبردنی زمان و دەربڕینی خێزان، بە کورتی ئاماژە بە گرنگترینیان دەکەم:

- ڕاستبێژی و دوورکەوتنەوە لە درۆ و دەلەسە و گەورەکردنی شتەکان.
- خۆدوورگرتن لە قسەی پاشملە و بوختانکردن و ناو و ناتۆرە لەیەکترنان.
- زۆر پێویست نەکات پەنا بۆ سوێندخواردن مەبە.
- دوورکەوتنەوە لەو جۆرە سوعبەت و گاڵتەکردنانەی کە قسەی نابەجێ و ناشیرینیان لەخۆ گرتووە.
- وازهێنان لە قسەی سووك و زمانپیسی.

- بەکارهێنانی لێکچوواندنی بەجێ و فشەنەکردن لە کاتی قسەکردندا.
- هیچ منداڵێك یان مرۆڤێك بە ئاژەڵ مەچوێنە و، هیچ سیفەتێکی ئاژەڵانەشی بەسەردا مەدە.
- دوورکەوتنەوە لە نەفرینکردن و جنێودان و قسەپێوتن.
- کەمدوویی تاوەکو مرۆڤ نەبێتە کەسێکی چەنەباز.
- لە کاتی دوان و گفتوگۆدا زۆر نزای خێر بۆ بەرانبەرەکەمان بکەین: خوا بتپارێزێت، لە پەنای خوادابیت، خوا تەمەندرێژت بکات.
- بە جوانترین شێوە و بەو ناوانەی کە خۆیان پێیان خۆشە خەڵکی بدوێنین و، نازناوی زانستیی و پیشەییان بەکاربهێنین، وەکو: (ئەندازیار)، (دکتۆر)، (مامۆستا).
- بەکارهێنانی ئەو دەستەواژانەی کە ڕێز و پێزانینیان پێوە دیارە، وەکو: (بەڕێزت)، (جەنابت)، (بە یارمەتیت).
- بەکارهێنانی ئەو وشانەی کە خاکیبوون و خۆبەکەمزانییان پێوە دیارە: (ببورە)، (سوپاست دەکەم)، (نازانم چۆن سوپاستان بکەم).
- وردبوونەوە لە وتە و قسەکانت و، بیرکردنەوە لە کاریگەرییان بەسەر دڵ و دەروونی دوێنراوەوە بەر لە دەربڕینیان.

• پەلەنەکردن لە قسەکردندا و، دەنگبەرزنەکردنەوە و، هاوارنەکردن.

• پشتڕاستکردنەوەی ئەو هەواڵ و قسانەی کە دەیانبیستین، بەر لەوەی پشتیان پێ ببەسترێت و، بگوازرێنەوە بۆ کەسانی دی.

• بەخۆدانەنازین و خۆهەڵنەکێشان و، زۆر بەکارنەهێنانی وشەی (من) و، (ڕای تایبەت و کەسیم) و، (پێم وایە) و، (بە بۆچوون و لێکدانەوەی خۆم).

• دووربکەوەرەوە لە بەکارهێنانی وشەی زریق و باق و، بایەخ بە ناوەڕۆکی چەمك و وشەکان بدە.

• خوێندنەوەی فەرهەنگەکان بۆ ئاشنابوون بە واتای وشەکان لە شوێنە جیاوازەکاندا.

منداڵان درەنگ وەخت فێری زمان دەبن، پێویستە دایك و باوکەکان لەو ماوەیەدا پشوودرێژبن و بێزار نەبن لە ڕێنماییکردن و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانیان.

دەیان بەها و ڕەوشتی دیکە هەن کە دەشێت قسە و باسیان لەبارەوە بکەین، بەڵام لەبەر ئەوەی پێم خۆشە ئەم پەیامەم لە کورتیدا ببڕمەوە، لێرەدا دەست هەڵدەگرین، خوای گەورە پشت و پەنای هەموو لایەك بێت.



# پەیوەندییەکانمان

سوننەت و یاسای خوای گەورە لە بوونەوەردا وای خواستووە کە هەموو شتێك یاسا و ڕێسای تایبەتی هەبێت و، تایبەتمەندییە خوودییەکانیشی پێکهێنەری ئەو یاسایە بن، هەروەها سوننەت و یاسای خوای گەورە وایە کە هەر یەك لە بەدیهێنراوەکانی کاریگەری بەدیهێنراوەکانی تری بەسەرەوە بێت، تەنانەت بەردیش؛ تەماشا دەکەیت خۆر و ئاو و هەوا و ئاگر کاری تێدەکەن... منداڵ لە میانی پەیوەندیگرتنی لەگەڵ کەسانی دی زۆر کارتێکراو دەبێت؛ چونکە لەدایك دەبێت تایبەتمەندییەکانی کەموکووڕن و، لە ڕێی هەڵسوکەوتکردنی لەگەڵ دایك و باوك و خوشك و براکانی و...وە فێری چەندین ئاکار و ڕەفتار دەبێت، لێرەوە دەتوانین بڵێین: سەنگی هەموو شتێك بە پەیوەندییەکانیەوە دەپێورێت، هەربۆیە پەیوەندییەکانی ناو خێزان پێویستی زۆریان بە لەبەرچاوگرتن و وردبوونەوە و وریایی هەیە، بێگومان تەواوی تایبەتمەندی و لایەنە باش و خراپەکانی مرۆڤ لە میانی هەڵسوکەوت و مامەڵەکردنی لەگەڵ

دەوروبەرەکەیدا دەردەکەون، هەر گۆڕانکارییەکیش بەسەر مرۆڤدا بێت، یاخود پاشەکشە بکات یان تووشی شکستێك بێت کاریگەری دەبێت بەسەر ئەو کەسانەشەوە کە لێوەی نزیکن.

تێکەڵاوی زۆری نێوان تاکەکانی خێزان و نۆریی کار و ئەرکە هاوبەشەکانی نێوانیان؛ شەڕ و ئاژاوە و پێکدادان دەخەنەوە، بە تایبەتیش ئەگەر هاتوو باوك و دایکەکە بە چاوێك سەیری منداڵەکانیان دەکرد کە هەرزە و کاڵفامن و پێویستیان بە ڕێنمایی و ئامۆژگارییکردنی زۆر بێت... بەڵام منداڵە گەنج و هەرزەکارەکان وەها نارواننە خۆیان، بەڵکو هەندێ جار بەپێچەوانەشەوە خۆیان بە تێگەیشتووتر و زاناتر دەزانن لە باوك و دایکیان، ئەوەش پەیوەندییەکانی نێو خێزان دەخاتە دۆخێکی هەستیارەوە و، وای لێدەکات کە پێویستی بە چاودێریکردن و سەرپەرشتیکردنی بەردەوام بێت.

**ئەمانەی خوارەوە چەند خاڵێکی سەرەکین لەو بارەیەوە:**

## ١- پەیوەندیمان بە دەوروبەرەکەمانەوە بەشێکە لە پەیوەندیمان بە بەدیهێنەرەکەمانەوە:

خانەوادەی موسوڵمان پەیوەندی نێوان تاکەکانی بە لقێك لەو پەیوەندییە دەزانێت کە بە پەروەردگارەوە وابەستەیان دەکات؛ واتە: هەڵوێستیان بەرامبەر بە یەکتری لە ڕەزامەندی خوای گەورە و ڕێنماییەکانی شەریعەتی ئیسلامەوە وەرگرتووە، چونکە ژن بەر

لەوەی هاوسەری پیاو بێت خوشکی مێردەکەیەتی لە ئیسلامدا، باوکیش بەر لەوەی باوک بێت برایە لە ئیسلامدا، دیارە هەموو موسوڵمانێکیش مافی بەسەر برا موسوڵمانەکەیەوە هەیە، هەروەها چەندین ڕەوشت و ئاکار هەن کە پێویستە لە نێوان موسوڵماناندا بە گشتی ڕەچاو بکرێن، موسوڵمان هەوڵی دڵخۆشکردنی برا موسوڵمانەکەی دەدات و، لە کاتی ئامادەنەبوونیدا بەرگری لێدەکات و، داکۆکی لە مافەکانی دەکات و، ستەم و خراپەکاری لێ دووردەخاتەوە و، لە کاتی سەختی و ناخۆشییەکاندا بەهانایەوە دەچێت و، قسەی خێری بۆ دەکات و، کە کەوتە هەڵەیشەوە لێی خۆش دەبێت... تەواوی ئەم شتانە دەبێت لە ژیانی خێزانداریماندا باشتر خۆیان بنوێنن؛ چونکە باوك لە برا زیاترە و، دایکیش لە خوشك زیاترە، لە پێغەمبەری خواوە(دروودی خوای لەسەر بێت) گێڕدراوەتەوە کە فەرمویەتی: ((**ما تحاب اثنان في الله -تعالى- إلا كان أفضلهما أشدهما حبًا لصاحبه**))[1] واتە: ((هەر کاتێك دوو کەس لەبەر خوا یەکترییان خۆشویست، باشترینیان ئەو کەسەیانە کە لەوی تر زۆرتر هاوڕێکەی خۆش بووێت)).

ئا ئەمەیە پێوەر: ئەو کەسەی براکەی زۆرتر خۆشبوێت و، باشتربێت بۆی و، مافی هاوڕێیەتی و برایەتی و خزمایەتی زیاتر بدات، باشترە و، شایستەی ئەوەشە خوای گەورە ڕێزی زیاتری لێبنێت.

---

١- صحيح ابن حبان: ٥٦٦

ئەم بیروباوەڕ و واتایە نابێت هەر تەنها لە چوارچێوەی تیۆریدا بمێنێتەوە، بەڵکو دەبێت بەردەوام ئامادەگی خۆی هەبێت تاوەکو پەیوەندیی ناوخۆ و دەرەوەی خێزان ئاڕاستە بکات، ئەڵبەت ئەمەش پێویستی بە هیممەتبەرزی و هەوڵ و تێکۆشان هەیە؛ چونکە کێشە و گیروگرفتەکانی ڕۆژانە چەندین واتای بەرز و شکۆدارمان لە بیر دەبەنەوە.

## ٢- چاوەڕوانی شتی زۆر لە یەکتری نەبین:

دایک و باوک هەڵدەستن بە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان، ئامانجیشیان لەوەدا نازپێدان و سەرنجڕاکێشانی منداڵەکان نییە بەرەو لای خۆیان، بەڵکو ئامانجیان ئامادەکردنیانە بۆ ژیانێک و، ڕاهێنانی دڵ و دەروونیانە بە جۆرێک کە بتوانن لەگەڵ سەردەمەکەیاندا سەرکەوتووانە هەڵبکەن، ئەمەش دیسان پێویست بەوە دەکات کە منداڵەکانیان بە چەشنێک پەروەردە بکەن بتوانن پشت بە خۆیان ببەستن و، کەمتر پشت بە کەسانی دی ببەستن چ لە ناو خێزان و چ لە دەرەوەی خێزان؛ چونکە منداڵ کە دەبینێت باوک و دایک و خوشك و براکانی زیاد لە پێویست چاودێریی دەکەن و ئاگایان لێیەتی و پێداویستییەکانی بە زیادەوە بۆ دابین دەکەن، ئیدی فێری ئەوە نابێت کە بەرپرسیارێتی لە ئەستۆ بگرێت و، ناشتوانێت وزە و توانا و لێهاتووییەکانی پەرە پێبدات، هەروەها سوود لە ئەزموونە

پێویستەکان وەرناگرێت، هەروەها کاتێك ئەندامانی خێزان چاوەڕوانی هاوکاری و بەدەمەوەچوونی یەکتری دەبن، دەبینیت کە ڕەخنە و گلەییان لە یەکتری ڕوو لە زیادبوون دەکات و، دڵیان لە خۆیان دادەمێنێت، شیاوی باسکردنە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) جەختی لەسەر ئەو مەبەستە کردەوە لە کاتی بەیعەت و پەیمان وەرگرتنی چەند هاوەڵێکیدا، پێی دەفەرموون: ((وَلاَ تَسْأَلُوا النَّاسَ شَيْئاً))[1] واتە: ((هیچ شتێك لە کەس سواڵ مەکەن))، گێڕەرەوە دەڵێت: (هەندێ لەو دەستەیەم لەوەودوا دەدی، کە داردەست و قەمچییان لە دەست دەکەوتە خوارەوە، لە کەس داوایان نەدەکرد کە بیداتەوە دەستیان نەبادا ئەوەیش بەر سواڵ بکەوێت، خۆیان دادەنەوینەوە یان دادەبەزین و هەڵیان دەگرتەوە.))

(ثوبان)یش دەڵێت پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: ((مَنْ تَكَفَّلَ لِي أنْ لاَ يَسْأَلَ النَّاسَ شَيْئاً وَأتَكَفَّلُ لَهُ بِالجَنَّةِ فَقُلْتُ: أنا، فَكان لا يَسْأَلُ أحَداً شَيْئاً)).[2] واتە: ((کێ مەرجم لەگەڵ دەکا کە هیچ لە خەڵك داوا نەکات هەتا منیش بە پشتی بەخشش و (کەرەم)ی خودا بەڵێنی بەهەشتی بدەمێ؟ منیش وتم: من، ئیتر لەوەودوا (ثوبان) داوای شتی لە کەس نەدەکرد هەتا مرد)).

---

١- موسلیم: ١٠٤٣

٢- ئەبو داوود: ١٦٤٣

پشت بەخۆ بەستن و چاوەڕێنەکردنی دەستی خەڵکی ڕەوشتێکی جوانە و، چەسپاندنی لە مێشك و دڵ و دەروونی منداڵاندا ئەرك و بەرپرسیارێتی خێزانە.

پێویستە لەسەر دایك و باوکیش ئەرکی سەر شانی منداڵەکانیان بە داخوازی زۆر و لەڕادەبەدەر قورس نەکەن؛ ناکرێت ئەرکی زۆر بە منداڵەکان بسپێریت، ئەگەر وا بکەیت، ئیدی چۆن منداڵەکانت فێری پشت بەخۆ بەستن دەبن و پەنا بۆ دوور و نزیك نابەن.

**شێوازەکانی فێرکردنی منداڵ کە پشت بە خۆی ببەستێت، زۆرن:**

- ئەگەر کەوت؛ هەڵی مەسێنەرەوە و، ڕاییبهێنە لەسەر ئەوەی کە خۆی هەستێتەوە بە مەرجێك تووشی پێکانێکی ئازاردەر نەبووبێت.
- منداڵ ڕابهێنە لەسەر ئەوەی ژوورەکەی پاك ڕابگرێت و شتە تێکدراوەکانی ڕێك بکاتەوە و، هەر کاتێکیش لە نانخواردن دواکەوت با خۆی خواردنەکە تێبکات.
- منداڵەکەت ڕابهێنە لەسەر ئەوەی چاوەڕێی دەستخۆشی دەستکەوتەکانی لە کەس نەکات و، بە تەمای هاندانی کەسیش نەبێت لەسەر هەر کارێك کە نیازی ئەنجامدانی هەبێت.

- ئەگەر هاتوو منداڵ دووچاری کێشەیەك بوو، ئەوا هەوڵبدە ڕاییبهێنیت کە خۆی چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە، ئەگەر دەستەوەستان ما، ئەوسا دەستی یارمەتی بۆ درێژبکە.
- بەردەوام هانی منداڵ بدە خۆی دەستپێشخەری بکات بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکان و ئەنجامدانی ئەرکەکانی، بێ ئەوەی کەس یارمەتی بدات.
- ڕێگەمەدە کوڕ یان کچە گەورەکەت داخوازی زۆر بدات بەسەر شانی خوشك و برا بچووکەکانیدا و، نەهێڵیت کوڕان ئەرکی زۆر بسپێرن بە خوشکەکانیان.
- منداڵ لەسەر ئەوە ڕابهێنە کە لە کاتی تەنگانەدا، یان کاتێك پێویستی بە یارمەتییەکە، پەنا بۆ خوای گەورە بەرێت و، داوای یارمەتی و بەهاناوەچوونی لێبکات.

## ٣- دان بە هەڵە و کەموکوڕییەکانماندا بنێین و، داوای لێبوردنیان لەسەر بکەین:

گومانی تێدا نییە کە تێکەڵاوی زۆری نێوان ئەندامانی خێزان پێشێلکردنی مافی یەکتری لێدەکەوێتەوە، لەم حاڵەتەشدا دوو شت پێویستە، یەکەمیان: ئەوەیە کە هەڵەکار ڕاشکاوانە دان بە هەڵەکەیدا بنێت و، دووەمیشیان: داوای لێبوردن لەو کەسە بکات کە هەڵەکەی بەرامبەر کردووە، لەمەشدا هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان گەورە و بچووکدا.

بەیانییەکیان خێزانێك لە خەو هەستان، سەیریان کرد دەرگای دەرەوەی خانووەکە لەسەر پشتە، بەو هۆیەشەوە باوکەکە زۆر پەست و تووڕە بوو؛ چونکە ئەوە مەترسییەکی گەورە لەسەر ئەو خێزانە و کەلوپەلەکانی ناو ماڵەکە دروست دەکات، خۆی و هاوسەرەکەی وا گومانیان برد کە فلانە کوڕیان کە درەنگانێکی شەو گەڕاوەتەوە لە پشت ئەو کارەوەیە، بۆیە باوکی زۆر بە توندی چاوی لێسوورکردەوە، بە جۆرێك لێی تووڕەبوو و هەڕەشەی لێکرد خستییە گریانەوە، پاش نیوەڕۆ دایکە بۆی ڕوونبووەوە کە کوڕە گەورەکە دوایین کەس بووە گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە، کەواتە هەر ئەویش دەرگاکەی لەسەر پشت بەجێ هێشتووە، بۆیە دایکە داوای کرد لە مێردەکەی کە داوای لێبوردن لەو کوڕەی بکات کە چاوی لێ سوور کردەوە، بەڵام ئەو ڕەتی کردەوە؛ چونکە کارێکی شیاو نییە و، ئەو کوڕە پێشتر چەندین جار بیری چووە دەرگاکە دابخات و، قەیدی چییە با ئەوەی پێی کراوە سزایەك بێت بۆ جارێك لەو چەند جارە، بەڵام کچە گەورەکە ئەو هەنگاوەی پێ جوان نەبوو و، وتی: باوکە براکەم بە ناهەق دڵی بریندار کراوە و، ئەو نەفامە و لەوە تێناگات کە لەسەر هەڵەی مانگێك لەوەپێش لێی تووڕە بوویت، ئیتر ئەوەبوو باوکی بە قسەی کرد و، داوای لێبوردنی لە کوڕەکەی کرد و، بەڵێنی پێدا بۆ جارێکی دیکە تا دڵنیا نەبێتەوە لە ڕووداوێك هیچ هەڵوێستێك وەرنەگرێت.

کاتێك بەرانبەر بە منداڵەکانمان دان بە هەڵەیەکمانـدا دەنێین و، داوای لێبـووردنی لەسـەر دەکـەین، ئـەوا لـە مێشـکیاندا گرنگیـی بەخۆداچـوونەوە و، داوای لێخۆشبوون لـەو کەسانەی کـە هەڵـەیان بەرانبەر دەکەن دەچێنین، ئەمانەش کاری گەورەن لە ژیانماندا.

## ٤- بنچینەی خێزان دوو هاوسەری پێکەوەگونجاون:

ئاشکرایە کە چەشنی ئەو پەیوەندییەی لـە نێوان ژن و مێرددا هەیـە ڕەنگدانـەوەی دەبێـت لەسـەر دڵ و دەروون و بیرکردنـەوەی تـەواوی ئەندامانی ئەو خێزانە، ئەوەش حاڵەتێکی سروشتییە، بێگومان دایك و بـاوکی پێکـەوەگونجاو و لەیـەك تێگەیشـتوو کەشـێکی ئـارام و شادیبەخش دەسازێنن و، بینای خێزان تۆکمە و توند و تـۆڵ دەکـەن، لـە ڕاستیشـدا: لێکتێگەیشتنی ژن و مێـرد و خۆشەویسـتی نێوانیـان کاریگەری دوور و درێژ بەسەر ژیانی منداڵەکانەوە جێدەهێڵێت، دیارە لە باوك و دایکیانەوە ئەو پێوەر و داب و نەریتانەیان بۆ دەمێنێتـەوە کە لە ئایندەدا لەگەڵ هاوسەرەکانیان دووبارەی بکەنـەوە، دەبینیت کچ بـەو تێڕوانینـەی کـە لـە دایکییـەوە بـۆی ماوەتـەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ مێردەکەیدا دەکات و، چاوەڕێی هەمان ئەو هەڵسوکەوتەشە لـە مێردەکەی کە باوکی نواندویەتی بەرانبەر بە دایکی، کوڕیش بەهـەمان شێوە، لەبەر ئەوە ئەزموون؛ خەڵکی بەگشتی فێری ئەوە کردووە کـە بەدواداچوون بۆ هەڵسوکەوتی ئەو دایکە بکـەن کـە نیـازی خـوازبێنی

کچەکەیانیان هەیە[1]، هەروەها پرسیار لەبارەی خزمانی دایکەکەو
دەکەن، واتە خاڵوان و پوورەکانی کچە خوازبێنیکراوەکە، چونک
پێیان وایە کە کچ لەسەر دایکی دەڕواتەوە.

کەوابوو دەتوانین بڵێین: لێکتێگەیشتنی هەردوو هاوسـ
گەورەترین دیارییە کە پێشکەشی منداڵەکانیانی بکەن، ئـ
تێگەیشتنەش بەندە بەم چەمك و بنەمایانەی لای خوارەوە:

أ. ئەو کەسەی کە هاوسەرگیری دەکات ـ پیاو بێت یان ئافرەت ـ ب
نیەتی وەرگرتن و چێژلێوەرگرتن و، دابینکردنی پێداویستیی
تایبەتییەکانی، بە سەرەتایەکی ساختە و چەواشەکاران
دەستپێکردووە، چونکە لە واتای قووڵی ژیانی خێزانداری
تێنەگەیشتووە، کە خۆی لە بەرخودان و بەخشیندا دەبینێتەوە
نەك وەرگرتن.

ب. ڕێزگرتنی ئافرەت لە لایەن پیاوەوە و، ڕێزگرتنی پیاویش لە لایەن
ئافرەتەوە کلیلی لێکتێگەیشتنە، بەڵام ڕێزگرتن واتایەکی نابێت
ئەگەر بێتو خەمی پێداویستییەکانی کەسی ڕێزلێگیراوی تێدا
نەخورێت و ڕەچاو نەکرێن.

ج. ڕێزگرتن لە هاوژینەکەت پێویستە ڕەچاوی ڕێزگرتن لە
بیروبۆچوون و تێگەیشتن و هەڵوێستەکانی تێدا بەدیکرابێت.

---

١- لە کوردەواری خۆشماندا باوە، دەڵێت: (دایە ببینە و دێتە بخوازە). وەرگێڕ.

د. جیاوازی سروشتی ژن و مێرد بنچینەیە و، ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر تێڕوانینیان و ئەو شتانەی کە بەلای هەر یەکەیانەوە بە گرنگ دەزانرێن.

هـ. پەیوەندیی ڕاستەقینەی نێوان ژن و مێرد پەیوەندییەکی ڕۆحی و هاوڕێیەتییە، ئەگەر پەیوەندیی نێوانیان تەنها لە سنووری پەیوەندیی جەستەدا بوو، ئەوا پەیوەندییەکی وشك و سارد و سڕ و سەرزاری و بەرژەوەندیخوازانەی لێدەردەچێت.

و. ئافرەت خواست و ئارەزووی هەیە و پێداویستیشی هەیە و، پیاویش بەهەمان شێوە، جا باشترین ڕێگە ئەوەیە کە هەوڵی دەستەبەرکردنی پێداویستیەکان بدرێت، بەپێی توانا دەستوەردان لە خواست و ئارەزووەکان کەم بکرێتەوە، چونکە خەڵکی پێیان خۆشە کەسێك هاوکارییان بکات لە دابینکردن و دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانیان، بەڵام حەز ناکەن کەس دەستوەربداتە ئارەزووەکانیان.

ز. کاتێك کێشە و ناکۆکی دەکەوێتە نێوان ژن و مێرد، ئەوا پێوستە لەسەریان فێری ئەوە ببن چۆن تەنگی پێهەڵدەچنن و لە قاڵبی دەدەن و وادەکەی کەم دەکەنەوە، ئەگینا ڕۆژانی شەڕ و ئاژاوەیان لە ڕۆژانی بەختەوەری و دڵخۆشیان زیاتر دەبن، ئەوەش شتێکە کەس پێی خۆش نییە.

## ٥- لێخۆشبوون چاوپۆشینە لە کەموکورتییەکان:

لێبوردەیی و لێخۆشبوون واتە: سازشکردن لەسەر شتێك کە دڵ ئارەزووی دەکات، هەندێ جاریش: سازشکردن لە هەندێ مافیش دەگرێتەوە، هەروەها بە واتای چاوپۆشیکردن دێت لە هەندێك لەو هەڵانەی کە ئەندامێکی خێزانەکە - گەورە بێت یان بچووك - تێیان دەکەوێت، ئامانج لە لێخۆشبوونیش ئەوەیە کە: پەیوەندییەکی تۆکمە و بێگەرد لە نێوان خانەوادەکەدا دروست ببێت و، یەکێتی و تەبایی تێدا پارێزراو بێت، سەبارەت بە هۆیەکانی لێخۆشبوونیش؛ یەکەمیان: بریتیە لە خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشتەکانی ئیسلام، بێگومان لێبوردەیی و لێخۆشبوون جۆرێکە لە چاکەکاریی و کارئاسانی و بەخشندەیی کە پێویستە لە هەموو موسوڵمانێکدا ڕەنگبدەنەوە، هۆی دووەمیشیان: لێخۆشبوون هەق بە هەقە، واتە وەك چۆن پێمان خۆشە کەسێك لە هەڵە و کەموکورتییەکانمان خۆشبێت و، سازش لەسەر هەندێ لە مافەکانی بکات بۆمان، پێویستە ئێمەش ئاوهابین لەگەڵ خەڵکیدا وەك پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: ((لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتى يُحِبَّ لأخيهِ ما يُحِبُّ لِنَفْسِهِ)).[1] واتە: ((کەستان بە تەواوی ئیمان و باوەڕ ناهێنێت هەتا هەرچی بۆ خۆی پێ خۆشە بۆ برای موسوڵمانیشی پێی خۆش نەبێت)).

---

١- بوخاری: ١٣، موسلیم: ٤٥

دوایین هۆکاریش بۆ لێخۆشبوون: تێگەیشتنی هەڵە و ناتەواومان بۆ بار و ڕەوشی یەکتری و، مەبەستی سەرەکی لە هەڵسوکەوتی خەڵکی دەوروبەرمان، واتە هەرچەندە زۆریش پێکەوە تێکەڵ بین، هێشتا هەر شتانێکی زۆر هەن کە لەوانەیە بەهەڵە لێیان حاڵی ببین.

ئەم منداڵە کە لە قۆناغی سەرەتاییدایە ڕۆژێکیان لەبەر بێتاقەتی داوای لە دایکی کرد ڕێگەی پێ بدات نەچێتەوە بۆ قوتابخانە، بەڵام دایکی ڕێگەی پێ نەدا؛ چونکە وای لێکدایەوە کە ڕاست ناکات و، لەبەر ئامادەنەکردنی ئەرکەکانی نایەوێت بچێتەوە بۆ قوتابخانە، ئەوەبوو کوڕەکە زۆر بە بێزاری و نابەدڵییەکەوە چوو بۆ قوتابخانە، پاش دوو کاتژمێر لە قوتابخانەوە پەیوەندی پێوە کرا و، داوای لێکرا سەردانی قوتابخانە بکات تا منداڵەکەی بەرێتەوە بۆ ماڵەوە کە تووشی بوورانەوە و لەهۆشخۆچوون بووە. ئەوەش کچێکە بێ ئەوەی لە دەرگا بدات چووە ژوورەکەی دایك و باوکییەوە، بۆیە باوکی زۆر پەست و تووڕە بوو و، هەڕەشەی لێکرد و، خستییە گریانەوە، دواتر ڕوونبووەوە کە کچەکەی وای زانیوە ژوورەکە کەسی تێدا نییە و، برا بچووکەکەی پێی ڕاگەیاندبوو کە باوك و دایکی لە باخچەی ماڵەکەن. لەو جۆرە هەڵوێستانەدا بەهۆی هەڵە تێگەیشتنەوە هەڵسوکەوتێکی خراپ دەنوێنین، بۆیە پێویستە لەسەرمان داوای لێبوردن بکەین و دان بەوەدا بنێین کە بەهۆی هەڵە تێگەیشتنێکەوە ئەو هەڵسوکەوت و مامەڵەیە ڕوویداوە.

**٦- دەست و دڵمان فراوان بێت و خەمی نەبوونی و قات و قڕی دامان نەگرێت:**

ئەمە خاڵێکی گرنگە بۆ پەیوەندییەکانی خێزان بە تایبەتی و، بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیش بە گشتی، دەبێت بڕوامان وابێت کە خوا کەس لە چاکە و ڕزق و ڕۆزی خۆی بێبەش ناکات. ئەقڵیەتی بەرچاوتەنگی و دەستنوقاوی چەندین گرفت و ناڕەحەتی بۆ خاوەنەکەی بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

دایک و باوک لەم بارەیەوە بەرپرسیاریەتی گەورە دەکەوێتە سەر شانیان؛ چونکە بێ ئەوەی ئاگایان لە خۆیان بێت بیرۆکەی هەبوونی کەسی براوە و دۆڕاو و، سەرکەوتوو و شکستخواردوو و، پەسەند و ناپەسەند لە مێشکی منداڵەکانیاندا دەچێنن، ئەمەش هەمووی لە میانی چەندین وتە و کردەوە و بەراوردکردنێکی نەرێنییەوە دەبێت، وەکو: "براکەت لە تۆ گوێڕایەڵترە". "خوشکەکەت لە داهاتوودا دەبێتە دکتۆرە، بەڵام تۆ دەبیتە کرێکاری کارخانەیەك. براکەت ژوورەکەی پاك و خاوێن ڕادەگرێت، بەڵام تۆ بێباکی و گوێنادەیتێ..."

لە ڕووی هەڵسوکەوتیشەوە هەندێ دایك و باوك هەن منداڵە بچووکەکەیان بۆ ماوەیەکی زۆر لە ژوورەکەی خۆیان گل دەدەنەوە، بەڵام ئامادە نین جێگەی برا گەورەکەی بکەنەوە و پێشوازییەکی

لێبکەن، هەندێ باوکیش بەهۆی زاڵبوونی هاوسەری یەکەمی بەسەریەوە پارەیەکی زۆر بۆ منداڵەکانی خەرج دەکات، کەچی بۆ منداڵەکانی هاوسەری دووەمی وا نییە و زۆر کەمیان بۆ خەرج دەکات؛ ئەمانەش وا دەکەن کە منداڵەکان هەست بەبێ پارەیی و بێ دەرەتانی بکەن و، لەسەر زۆر شت بەربەرەکانێ لە نێوانیاندا دروست ببێت و، کار بگاتە ئەوەی هەر یەکە لە جێی خۆی بڵێت: یان من یان ئەو!

با بەردەوام لە بەرچاوی منداڵەکانمان ئەوە بڵێینەوە کە دەرگاکانی خێر و چاکە زۆرن و، ئەو دەرفەتانەی نادیار و بەڕێوەن زۆر لەو دەرفەتانەی دیار و ئاشکران زیاترن، دەبا بە یەك چاو تەماشای هەمووان بکەین و، بە یەکسانی ئامێزی خۆشەویستیمان والاکەین بۆیان، بە منداڵەکەت بڵێ: "پارچەیەك لەو کێکە یان ئەو شیرینییەی بە دەستەوەیە بدە بە خوشکەکەت و، ئەوسا منیش پارچەیەکی گەورەتر دەدەمە تۆش و ئەویش"، بە کیژۆڵەکەشت بڵێ: "وەرە ئێرە لای برا بچکۆلانەکەت دابنیشە" و، تۆیش ئامێزی خۆشەویستی و بەزەیی و میهرەبانی خۆتیان بۆ والا بکە.

با هەمیشە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەمان لەیاد بێت: ﴿الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ وَاللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلاً وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ البقرة: ٢٦٨. واتە: (شەیتان دەتانترسێنێت بە هەژاری ئەگەر ماڵتان لەڕێگەی خوادا صەرف بکەن و، ئەمرتان پێ

دەکات کە بەخیل بن و صەدەقە نەکەن. خودایش وەعدەی عەفوی قیامەت و دەوڵەمەندیی دنیاتان دەداتێ. خودا نیعمەتی فراوانە و زانایە و ئاگای لەو کەسەیە کە ماڵی لە ڕێگەی ئەوا بەخت کردووە و، نایەڵێت فەقیر و هەژار بکەوێت. شەیتان دوژمنتانە و ڕێگای گەداییتان پیشان دەدات و خوو و کردەوەی ناشیرینتان فێر دەکات، بەگوێی مەکەن با لە خشتەتان نەباو ماڵ وێرانتان نەکات.) هەوڵیش بدەین کەوا گیانی گەشبینیی لەدڵ و دەروونیاندا زیندوو بکەینەوە.

## ٧ـ ڕێزلەیەکترگرتن وا لە منداڵی هەر خێزانێک دەکات ئەرێنیانە هەڵوێست بەرانبەر هەموو کەسێک وەربگرن:

ئەو پەروەردە پاکەی منداڵەکانمانی لەسەر گۆشدەکەین، هانیان دەدات ڕێز و پێزانینیان بۆ کەسانی دیکە هەبێت و، هیوای خۆشبەختییان بۆ بخوازن و... ئەڵبەت ئەم واتا و مەبەستانەش سەرەتا لە پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزانەکەوە لەگەڵ یەکتری بەرجەستە دەبێت، بۆ نموونە کچ لە مامەڵەی دایکییەوە لەگەڵ باوکی و، هی باوکی لەگەڵ دایکی فێری ڕێزگرتن دەبێت، منداڵی بچووکیش لە خوشک و برا گەورەکانییەوە فێری ڕێزگرتن لە گەورە و بەزەییهاتنەوە بە بچووک دەبێت، ئەوەی ڕاستیش بێت سروشتی مرۆڤی نۆر بەڕێز ئەوەیە کە ڕێز لە کەسانی شایستە و ناشایستەش بگرێت، چونکە گەورەیی ئەو کەسە لە ئاستێکدایە ڕێگرە لەوەی

خەڵك پۆلێن بكات بۆ كەسی زۆر بەڕێز و، كەسی بەڕێز، یان كەسی نیمچە ڕێزدار و، كەسێك كە شیاوی سووكایەتیپێكردن بێت، بێگومان ڕێزگرتنی مرۆڤیش لە خەڵكی لە چەند ڕوویەكەوەیەوە:

أ. ڕێزگرتن لە خودی كەسەكە بەو پێیەی كە مرۆڤە، خوای گەورە ڕێزی لە مرۆڤ نا و، فریشتەكانی ناچار بە كڕنووشبردن كرد بۆ باوكە ئادەم پاش ئەوەی ڕۆحی بەبەردا كرد، كەوابوو گەورە و بچووك لە هەر بارێكدا بن پێویستە بایەخیان پێبدرێت و ڕێزیان لێبگیرێت و بەزەییمان پێیاندا بێتەوە.

ب. ڕێزگرتن لە تایبەتمەندییەكانی، ڕەوا نییە سیخوڕی بەسەرەوە بكەین و، دەبێت دەستوەرنەدەینە كارەكانی و، لە خۆمانەوە نووسراو و كاغەزەكانی هەڵنەدەینەوە و دەست نەكەین بە گیرفانەكانی كراس و پۆشاكەكانیدا، مەگەر لە حاڵەتی زۆر پێویست و ناچاری، ئەوسا دایك و باوك دەتوانن ئەو كارە بكەن، وەك ئەوەی گومانی زۆرت لێی هەبێت، یاخود دڵنیابیت كە منداڵەكەت بەهۆی كێشەیەكەوە خەریكە ژیانی دەكەوێتە مەترسییەوە.

ج. ڕێزگرتن لە ڕا و بۆچوون و بژاردە و سەرنجەكانی، ئەڵبەت ڕێزگرتن و لەبەرچاوگرتنی ئەو شتانەش ئەوە ناگەیەنێت كە بە لای تۆوە پەسەندبن، هەمووومان لەسەر ئەوە كۆكین، بەڵكو داننانە بە بوونی دید و تێڕوانین و بۆچوون و سەرنجی فرەلایەن بۆ ئەو

شتانه و، هەموو کەسێکیش مافی ئەوەی هەیە ئەو لایەنە پەسەند بکات کە بە دڵیەتی، جا بەو پێیەی تاکەکانی خێزان یەکەیەکی توندوتۆڵی کۆمەڵایەتین، ئەرکی سەرشانی گەورە و بچووکیانە ناوبەناو ڕێنمایی یەکتری بکەن.

د. فشار نەخستنە سەر کەسی بەرانبەر تا بۆچوونی خۆی بڵێت، هەروەها فشاری نەخرێتە سەر تاکو ڕا و بۆچوونی، یان ئاینزای، یان بژاردەی بگۆڕێت.

مرۆڤایەتی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دەستەوەستان ما لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ ئەو توندوتیژییە کۆمەڵایەتییەی کە لە ئەنجامی ڕکابەریکردن لەسەر سەرچاوەگەلێکی دیاریکراو و، پلە و پایە و دەسەڵات پەیدا دەبێت و، هەوڵی زۆری داوە کە لە ڕێی ناوبراو بە: (ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییەکانەوە) تینەکەی دامرکێنێتەوە و، جیاوازی تەمەن و زانست و دامەزراویی کردە بنچینەیەك بۆ ئەوە، واتە کەسی گەورە و بەتەمەن بە بۆنەی تەمەنەکەیەوە پێویستە لە لایەن کەمتەمەن و بچووکەکانەوە ڕێزی لێبگیرێت و، زانا و ئەزموونداریش لە لایەن نەزانەوە و، کەسی دامەزراو و چاکەخوازیش لە لایەن کەسانی ئاسایی و بەرەو خوارەوە، ئەم کلتوورەش لە دێر زەمانەوە بۆمان ماوەتەوە و، خوای گەورەش فەرمویەتی: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ الحجرات: ١٣. واتە: (بەڕاستی بە قەدر و حورمەترتان لای خودا ئەوەتانە زۆرتر لە خوا بترسێت و خۆی لە گوناه بپارێزێت.)

پێغەمبەری خواش (دروودی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ((مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيَعْرِفْ حقَّ كَبِيرِنا؛ فليس منا)). واتە: ((ئەو کەسەی بەزەیی بە بچووکماندا نەیەتەوە و مافی گەورەمان نەزانێت، ئەوە لە ئێمە نییە))[1].

بچووک ڕێز و حورمەت لە گەورە دەگرێت و پابەند دەبێت بە ڕێنماییەکانییەوە، گەورەش بەزەیی بە بچووکدا دێتەوە و، دڵی بۆی دەسووتێت و، دەستی یارمەتی بۆ درێژ دەکات، کەسی دیندار و خواناس و دامەزراویش جێگەی ڕێز و پێزانینی کەسانی ترە و، لە لایەن خۆشیەوە خەمی هەمووان دەخوات و بەزەیی پیایاندا دێتەوە و، ڕێنوێنییان دەکات و، دەستیان دەگرێت بەرەو سەرفرازی، ڕێزگرتنێکە پڕیەتی لە هاوسۆزیی و خەمخواردن و سوودپێگەیاندن و ڕێنوێنیکردن.

## ٨- بەشداریکردن لە پەرستش و فێربووندا:

سوپاس بۆ خوا چەندین خانەوادەی چاکەکار و چاکەخوازمان هەن و، چەندین خانەوادەی خەمخۆر بە دین و دونیای خۆیانمان هەن، بەڵام مەخابن گرفتێکی تێدایە ئەویش ئەوەیە کە گیانی تاکیەتی و خۆپەسەندی لە کۆڵ تاکەکانی نەبووەتەوە، باوک سەرقاڵی کارەکانیەتی و، دایک سەرگەرمی ئیشوکارەکانیەتی و، منداڵەکانیش

---

١- ئەبو داوود: ٤٩٤٣

هەر یەکەیان خەریکی کارێکە، یان لە ژوورەکەیەتی یان بە دیار تەلەفیزیۆنەوە دانیشتووە یان بە تەلەفۆن و مۆبایل سەرگەرمی قسەکردنە لەگەڵ هاورێکانی. هەر بەڕاستی خەریکەماڵەکانمان بەرەبەرە وەکو (ئوتێلەکان) یان لێدێت، بێگومان ئەوەش کاریگەریی خراپی لەسەر پرۆسەی پەروەردەکردن دەبێت؛ چونکە تێکەڵاویی ئەندامانی خێزان لەگەڵ یەکتری سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ پێگەیشتنی بچووکەکان و، بەهێزکردنی پەیوەندیی نێوانیان... کەوابوو دەستەبەرکردن و ئەنجامدانی ئەو چالاکیانەی کە تەواوی تاکەکانی خێزان لەگەڵ یەك کۆدەکاتەوە کارێکی هێجگار گرنگە، لەو چالاکیانەش:

١. پاڕانەوە و ستایشی خوای پەروەردگار، لە ئیبن عەباسەوە (خوا لە خۆی و باوکیشی ڕازی بێت) هاتووە، کە: ((هەر کات ویستبێتی خەتمی قورئان بکات، هاوسەر و منداڵەکانی کۆدەکردنەوە و، پێکەوە نزای خەتمیان دەخوێند)).

٢. وتنەوەی هەندێ لەو سروودانەی کە پڕن لە واتا و مەبەستی جوان و بەکەڵك.

٣. دەکرێت ئەو تاکانەی خێزان کە نوێژی بەکۆمەڵیان لەسەر نییە لە ماڵەوە نوێژەکانیان بە کۆمەڵ ئەنجام بدەن، دەکرێت تەواوی ئەندامانی خێزانیش بەکۆمەڵ شەونوێژ ئەنجام بدەن.

٤. بەشداریکردن لە خزمەتکردنی چەند لایەنێك یان چەند خانەوادەیەکی هەژار و دەستکورت و، جێبەجێکردنی چەند پرۆژەیەکی خێرخوازیی هاوبەش.

٥. منداڵە بچووکەکان لەسەر ئاخاوتن و قسەکردن ڕابهێنرێن و، هەوڵ بدرێت هونەری گفتوگۆکرنیان فێر بکرێت و، بە پەرۆش و بایەخەوە گوێیان لێبگیرێت.

٦. ڕاسپاردنی یەکێك لە منداڵەکان بە کورتکردنەوەی چیرۆکێك، یاخود ڕۆمانێك، یان پەرتووکێك و، کۆبوونەوەی خێزانەکەی بۆ گوێگرتن لەو پوختەیە و گفتوگۆکردن لەسەری.

٧. سەردانیکردنی کتێبخانەکان و پێشانگاکانی کتێب و، هەڵبژاردن و کڕینی ئەو کتێبانەی کە بۆ خێزانەکە گونجاون.

٨. ڕێکخستنی یارییەکی کۆمەڵایەتی سادە و ساکاری ئاسوودەبەخش، هەر تاکێکی خێزانەکە سەرپشك بکرێن لە بەشداریکردنیدا. ئەو جۆرە کار و چالاکیانە هەستی تەبایی و یەکڕیزی بۆ خێزانەکە دەگێڕێتەوە و، خۆشی و شادی دەخاتە دڵەکانیانەوە و، چەندین سوود و قازانجی دیکەشی دەبێت بۆیان.

## ٩- بە دڵێکی پاك ڕەخنە لە یەکتری دەگرین:

خێزانی موسوڵمان دەربارەی ڕەوش و کاروبارە جیاوازەکانی خۆی پێویستی بە ڕەخنە لەخۆگرتن و گفتوگۆی ئازادە، هەڵبەت

ڕەخنەگرتنەکەش لەو کەلێن و کەموکورتیەیە کە لە ژیانی ڕۆژانەی خێزانـدا ڕەنگیداوەتـەوە و پێویستـی بـە دۆزینـەوەی ڕێگەچارە و زەمینەسازیی هەیە، بێگومان هیچ خێزانێك ناتوانێت بڵێت: حاڵم باشە و هیچ کێشـەم نییە. ڕەخنـەی نێـو خێـزان لـەبارەی ڕەوشی گشتی خێزانەکە و، لە لایەن تاکێکی ئەو خێزانە لە تاکێکی تری ئـەو خێزانە دەگیرێـت، لـەم سـۆنگەیەوە لەسـەر بـاوك و دایـك پێویستـە هـانی منداڵەکانیان بدەن تـا سـەرنجەکانیان دەربارەی ڕەوشـی خێزانەکە بخەنەڕوو، تاوەکو هەر تاکێکی ئـەو خێزانـە هەست بکات دەتوانێت ئـەوەی پێـی خۆشـە بیلێـت و، تـاوەکو منداڵـە بچووکەکانیش فێری ڕەخنەگرتنی بابەتیانـە و هێمنانـە ببن، چونکە ئـەوەی ڕاستی بێت خێزان لە بنەڕەتدا سـەنتەرێکی ڕاهێنانـە بۆ وەرگرتن و دەرخستنی لێهاتوویی و کارامەییە جیاوازەکانی ژیان. ئەمە منداڵێکە لـە قۆناغی سەرەتاییدایە بە دایکی دەڵێت: سەر بە هەر ژوورێکدا دەکەم دەبینم گڵۆپەکانی هەڵکراون و سپلێتەکەشی ئیش دەکات، کەچی کەسیشی تێدا نییـە، ئـەو کـارەش بـەفیڕۆدانی کارەبایـە، ئـەوەش کچێکە لە قۆناغی ناوەندی بە باوکی دەڵێت: کە تـۆ گەشـت دەکـەیت، ئێمە بۆ نوێژی بەیانی تەمەڵیی دەنوێنین، زۆربەیان هەڵناسن ئەگەر تۆ هەڵیان نەسێنیت، ئـەوەش منداڵێکـە بـە دایکـی دەڵێـت: ماوەیەکـە شـەوان درەنگ دەنوین، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە هەندێ جار خۆم و خوشك و براکانم لەناو پۆل و لە کاتی وانەکاندا خەو بمانباتەوە.

وەرگرتنی ڕەخنەی منداڵەکانتان بە سنگێکی فراوانەوە و پێشوازیی لێکردنی؛ هاندەرێکی باشە بۆیان تا لەسەری بەردەوام بن، هەر تەنها پێشوازیلێکردنیش بەس نییە، بەڵکو پێویستە گفتوگۆ دەربارەی ڕەخنە و قسەکانیان بکرێت و سوودیان لێوەربگیرێت.

سەبارەت بە ڕەخنەگرتنی تاکێکی خێزانیش لە تاکێکی دی، ئەمەیان پێویستی بە وریاییەکی زۆر هەیە، چونکە پەیوەندییە خێزانییەکان لە ئاستی باڵادا کز و لاوازن و، ڕەنگە بە ئاڕاستەکردنی ڕتەیەکی ڕەق و بریندارکەر لە لایەن پیاوەکەوە دژ بە هاوسەرەکەی یان بەپێچەوانەوە، یاخود لە لایەن خوشکەوە بۆ براکەی و بەپێچەوانەوە نزیکەی مانگێک دڵەکان لە یەکتری بتۆرێنێت، کاتێک ئەم جۆرە قسانەش تەشەنە دەسێنن، بێگومان نائومێدی و ڕەشبینی و ناتەبایی ڕوو لە ژیانی ئەو خێزانە دەکات. کەوابوو ئەگەر یەکێك لە منداڵەکان شتێکی ناڕەوا و نەشیاوی بە خوشکێك یا برایەکیەوە بەدیکرد، ئەوا با بیر لە شێوازی دەربڕینی سەرنجەکەی خۆی بکاتەوە و، هەوڵ بدات کات و دەربڕینی گونجاوی بۆ هەڵبژێرێت، ڕەنگە وا پێویست بکات ڕاوێژێك بە باوکی بکات لەسەر ئەم بابەتە، لەوانەشە وا باش بێت باوك یان دایك ئەو منداڵەیان بدوێنن.

جاری وایە سەرنج و تێبینییەکە لەسەر دایك یان باوکە، ئەوکات وا باشە کەسێکی گەورە (کوڕ یان کچە گەورەکە یاخود دایکەکە ئەگەر سەرنجەکە لەسەر باوکەکە بوو) باسەکەیان لەگەڵ بکاتەوە، بە

هەر حاڵ، پێویستە ڕەخنەگرەکە وریای ئەو پەیوەندییە بێت کە لە نێوان خۆی و کەسی ڕەخنەلێگیراودا هەیە؛ چونکە ئەگەر ڕەخنەگر گوێ بەوە نەدات، ئەوا زیانی زیاتر دەبێت لە قازانج، هەڵبەت نموونەی زۆریشمان لەبەر دەستدان کە دەریدەخەن ڕەخنەی ڕووخێنەر سارد و سڕی زیاتری لە نێوان ئەندامانی خێزاندا دروستکردووە و لە یەکی دابڕاندوون، بێ ئەوەی چارەسەرێکی ئەو گرفتە کرابێت.



# ئەرکەکانمان

دونیا خانە و لانەی هۆیەکان و پڕۆژەکان و ئەرکەکانە، ئێمەش ناتوانین هیچ شتێکی بەهادار بەدەست بخەین بەبێ هەوڵ و ماندووبوون و ڕەنجکێشان، دیارە ئێمەش بەشێکین لە کۆمەڵگەیەك و، بەشێکین لە میللەتێك، جا بەدیهاتنی خەون و دیدگا و بەهاکانمان لە ئێستادا پێویستیان بە هۆشیاری هەیە دەربارەی ئەو کار و ئەرکانەی پێویستە ڕایانپەڕێنین، ئەوەی ڕاستیش بێت گەر بێتو خێزانەکان لە میانی خواست و ئاواتەکانیانەوە هەڵبسەنگێنین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە زۆربەیان هیوا و ئاواتی گەورە و ئومێدبەخشیان هەیە، بەڵام ئەم هەڵسەنگاندنە ورد و واقیعی نییە، چونکە ژیانی خێزانەکان و ژیانی خەڵکی لە میانی هیوا و ئاواتخواستن و دروشمەوە گۆڕانکاریی بەسەردا نایەت، بەڵکو لە میانی دەستپێشخەریی کرداریی و پڕۆژەی بەرجەستەکراوەوە گۆڕانکاریی بەسەردا دێت. خێزانی موسوڵمان بەو پێیەی کە بە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی تۆکمە و بەهێز ناسراوە، پێویستە لەسەری بارودۆخی تایبەتی خۆی چاك بکات و

گۆڕانکاری بەسەر باری گشتیشدا بهێنێت و، بە گژ گەندەڵی و خراپەکاراندا بچێتەوە، هەوڵدەدەم لە خوارەوە ئاماژە بە چەند کارو ئەرکێکی چاوەڕوانکراو بۆ خێزانەکانمان بکەم:

## ١- ئامادەکردنی منداڵەکان بۆ ژیانێکی شەرەفمەندانە:

هەر شتێك سەر ئێشەی زۆر نەبوو، تێچوونیشی کەمە و، هەندێ جاریش بە ئاسانی و بێ خۆسەغڵەتکردن دەست خەڵکی دەکەوێت، بە هەمان شێوەش ئەگەر ئاسایی بێت بەلامانەوە منداڵەکانمان هەر جۆرە ژیانێکیان هەبێت و، لە ئایندەشدا هەر جۆرە کارێکیان دەستبکەوێت و، پێگەی کۆمەڵایەتیشیان لە هەر پلە و ئاستێکدا بێت، ئەوا پێویست بەوە ناکات خۆمانی بۆ سەغڵەت بکەین، چونکە سەرئێشەی نیە، ئەو ئامانجە بەدەستهێنانی ئاسانە: خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و شوێنی نیشتەجێبوونیان بۆ دابین بکە و لە یەکێك لە قوتابخانەکانی گەڕەکەتدا ناویان تۆمار بکە، ئیتر دوای تەواوکردنی خوێندنی بنەڕەتی وازیان لێبهێنە چ شوێن و بوارێکیان پێخۆشە هەڵیبژێرن، لەگەڵ کەمێك ڕێنمایی و چاودێریی پەروەردەیی. بۆ ئاگاداریشت ئاژەڵیش خوای گەورە بە چەشنێك دروستیکردووە کە دەتوانێت ئەو چەشنە چاودێریکردن و سەرپەرشتیکردنە پێشکەش بە بێچووەکانی بکات هەتا گەورە دەبن و لەسەر پێی خۆیان دەوەستن و دەتوانن پارێزگاری لە خۆیان بکەن و نان و ئاوی خۆیان پەیدا

دەکەن، بەڵام ئەگەر بمانەوێت ڕۆڵەکانمان کەسانێکی خواناس و چاکەکار و دامەزراویان لێدەربچێت و، لە ناو هاوچەشنەکانیاندا پێشەنگ بن و، خێزانی بەختەوەر و سەرکەوتوو پێکەوە بنێن و، بەشداریی چاکسازیی کۆمەڵگاکانیان بن، ئەوا ئەرك و بەرپرسیارێتی سەرشانمان زۆر قورس دەبێت، ناشبێت بێزاریی ڕوومان تێبکات؛ چونکە باوکان و دایکانمان لەوەوپێش ڕەنجی زۆریان لەگەڵ کێشاوین، سبەینێش ڕۆڵەکانمان لەگەڵ منداڵەکانیان دەیکێشن، ئەوە سوننەت و یاسای پەروەردگارە لە پەروەردەکردندا. پێم وایە ئامادەکردنی ڕۆڵەکان بۆ ژیانێکی شەرەفمەندانە پێویستی بە جەختکردنەوە لەسەر ئەم مەبەست و مانایانە هەیە:

أ. باسی سروشتی ژیانی دونیایان بۆ بکەین، کە خانەی تاقیکردنەوەیە، هەربۆیە ستەمکار و ستەملێکراو، دەستدرێژیکار و دەستدرێژیلێکراویشی تێدایە، هەروەها باسی ئەوەیان بۆ بکەین کە سروشتی ئەم ژیانە وایە کە ببەخشین و وەربگرین و، کارتێکەر و کارتێکراو بین و، دڵخۆش و خەمبار بین و، سەرکەوین و شکست بهێنین و...

ڕۆژێکیان باوکێك کەوتە باسکردنی ئەو ڕۆژە سەختانەی کە بە منداڵی بەڕێی کردوون، لەو قسانەی کە کردنی بۆ منداڵەکانی: "باوکم کەسێکی زۆر نەدار و دەستکورت بوو و، ڕۆژانە کاری بۆ خەڵکی دەکرد، زستانانیش مانگ و دوو مانگ بەبێ کار لە ماڵ دادەنیشت،

ناچار بەو بۆنەیەوە لە باتی سێ ژەم دوو ژەم نانمان دەخوارد، جاری وابوو لە کراسێك زیاتر هیچی ترم شك نەدەبرد، هەرکاتیش بشۆردرایە، دەبوو لە ماڵ نەیەمە دەر و چاوەڕێ بکەم تاوەکو وشك دەبێتەوە، وەرزی زستان تەواو نەدەبوو باوکم کۆڵێك قەرزی دەهێنایە سەر خۆی، هاوینانیش لە کولەمەرگیدا دەژیاین تاوەکو باوکم بتوانێت ئەو پارەیەی کە لە زستاندا قەرزی کردووە بیداتەوە..." لێرەدا باوکەکە سەیری کرد یەکێك لە کچەکانی لە تاودا چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك، بەڵام کوڕە گەورەکەی وتی: "بابە ئەی چۆن بەو حاڵەوە توانیت بچیتە زانکۆوە؟" باوکی وتی: "کوڕی خۆم تەنگانە تا سەر نییە، خوا لە پاش تەنگانە و ناڕەحەتی خۆشگوزەرانی دەهێنێت و دەرووی خێر دەکاتەوە، خانەوادەکەمان هەستان بە دابەشکردنی میراتی باوکی باپیرەم، پشکی باوکیشم لەو بەشە میراتە زۆر باش بوو، باپیرەتان بەو پارەیە دوکانێکی میوەفرۆشی کردەوە، ئیتر لەو ڕۆژەوە ژیانمان تا دەهات ڕووی لە باشی دەکرد و، سوپاس بۆ خوا لە تەنگانە ڕزگارمان بوو". یەکێك لە منداڵەکان وتی: "باوکە چۆن بەرگەی ئەو هەموو تەنگانەیەتان گرت؟!" باوکی وتی: "خەڵکانێکی زۆری گەڕەك و زۆرێکیش لە خزمانمان حاڵ و گوزەرانیان وەك ئێمە بوو، بەدەمەوەچوون و سۆز و خەمخۆری بۆ یەکتری، ئەو نەهامەتیانەی لەسەر سووك کردبووین، ئەوەش باسێکی دوورودرێژە و پێویستی بە دانیشتنێکی تایبەت هەیە".

ب. پێویستە دەربارەی خووڕەوشت و ئاکار و ڕەفتارەکانی خەڵکیش شتێك بۆ منداڵەکانمان باس بکەین و، بۆیان ڕوونبکەینەوە کە جیاوازیی زۆریی تاکەکەسییان تێدایە و، بە دەگمەن کەسێك هەڵدەکەوێت بیرکردنەوە و ئارەزوو و بەرژەوەندی و پێداویستییەکانی لەگەڵ کەسێکی دیکەدا یەکبگرنەوە. گرنگ لەمەدا ئەوەیە ڕوونکردنەوەکە بۆ منداڵانە و پێویست بەوە دەکات بەشێوەیەکی سادە و ئاسانکار و بەشێوەی خوێندنەوە و گێڕانەوەی چیرۆك و ڕووداو و بەسەرهات بێت، تاوەکو مێشکیان وەریبگرێت و، دەرفەتی ئەوەشیان پێبدەین پرسیارەکانیان بکەن و گفتوگۆ لەبارەی بابەتەکانەوە بکەن.

باوکێك دەربارەی تێکەڵاوی و پێکەوەبوون و هەماهەنگی کۆمەڵایەتی منداڵەکانی دەدواند و، باسی ئەوەی بۆ دەکردن کە دەبێت مرۆڤ خەڵکی بە باشی بناسێت و، هەوڵبدات ئەوانیش بە باشی بیناسن، لەو سەروبەندەدا خاڵێکی گرنگی بە مێشکدا هات باسی بکات بۆیان، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ هەرچییەکی لەدەستدا بێت بیکات، هێشتا هەر ناتوانێت تەواوی خەڵك لە خۆی ڕازی بکات؛ چونکە پێوەرەکانی مرۆڤ بۆ بڕیاردان بەسەر شتەکاندا یەك شت نین، بەو پێیەش بێت مرۆڤ نابێت لە وتن و لە کردنی ئەو شتە پاشگەز ببێتەوە کە بەلایەوە ڕاست و ڕەوایە، بە مەرجێك ئاگای لەوە بێت کە خەڵکی بە هەڵە لێی تێنەگەن، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتەش چیرۆکێکی

کۆنی بۆ گێڕانەوە: ڕۆژێکیان پیاوێک خۆی و منداڵە تەمەن دە ساڵانەکەی بە سواری گوێدرێژێکەوە ڕوویان کردە گوندەکانی نزیک دەوروبەری خۆیان، وەختێک چوونە یەکەم گوندەوە باوکەکە بەسواری گوێدرێژەکەوە بوو و، منداڵەکەشی بە پێ دەڕۆیشت، هەندێ لە دانیشتوانی گوندەکە کە ئەوەیان بینی وتیان: ئەو پیاوە چەند کەسێکی دڵڕەق و بێبەزەییە لە ئاست ئەو منداڵە بچووکەدا، دەبووایە لەگەڵ خۆی سواری بکردایە، کە ڕوویان کردە گوندێکی دیکە، هەردووکیان بەسواری گوێدرێژەکەوە بوون، هەندێ لە دانیشتوانی گوندەکە وتیان: ئەی لەو گوێدرێژە چەند داماوە، باری زۆری لێنراوە، وا پێویستی دەکرد کە یەکێکیان سوار بووایە و ئەوی دیکەیان بەپێ بڕۆشتایە، ئینجا ڕوویان کردە گوندی سێیەم، ئەمجارەیان کوڕەکە سوار بووبوو و باوکەش بەپێ دەڕۆیشت، ژمارەیەك لە دانیشتوانی گوندەکە وتیان: ئەو کوڕە ڕێز لە باوکی ناگرێت، ئاخر چۆن ڕووی دێت خۆی سوار بێت و باوکیشی بە پێ بڕوات؟! بۆ چوارەم گوندیان هەردووکیان بە پێ ڕۆیشتن و گوێدرێژەکەیان بە دوای خۆیاندا کێش کرد، دانیشتوویەکی گوندەکە وتی: ئەم دوو کەسە چەند گەوجن: ئاخر چۆن دەبێت گوێدرێژێکیان پێ بێت و هیچ کامێکیان سواری نەبن؟! لێرەدا باوکە بە منداڵەکانی وت: "ئەو پیاوە چ شتێك ماوە نەیکردبێت؟" گەورەکەیان وتی: "هەر ئەوە ماوە گوێدرێژەکە بەسەر شانیانەوە - ئەگەر بتوانن - هەڵبگرن و

بکەونە ڕێ، ئەوسا تاوانی شێتبوونیشیان دەدەنە پاڵ"، ئیتر هەموویان بەجارێك دایانە قاقای پێکەنین... باوکیان وتی: "ڕۆڵەکانم پوختەی باسەکە لەم پەندە کۆنەدا خۆی دەبینێتەوە: ڕەزامەندی خەڵك ئامانجێکە هەرگیز نایگەیتێ."

ج. ئامادەکردن و ڕاهێنانی منداڵ بۆ ژیان ئامادەسازییەکە بۆ ژیانی ئایندەیان، ڕاستە ئاینده نادیارە و تەنها خوا خۆی دەزانێت چی تێدا ڕوودەدات، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین کە ئاینده لەدایکبووی ئەمڕۆیە و، زۆربەی ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی داهاتوو پێشهاتی ئەمڕۆن، پێشم وایە ئەوەی پێویست بکات لێرەدا تیشکی زیاتری بخەینەسەر، ئەوەیە کە لە ئاینده‌دا کۆمەڵگە لێکترازانی زیاتر تێدەکەوێت و، بەرژەوەندییە کەسییەکان دەبنە یەکێك لە کارە لەپێشینەکانی خەڵك، ئەوکات پێویست دەکات مرۆڤ خۆی بۆ چەندین کێشە و سەختی ژیان ئامادە بکات، بێ ئەوەی چاوەڕێی یارمەتی و بەهاناوەچوونێکی ئەوتۆ بکات، لە ئایندەدا هەموو شتێك بەبێ باج نابێت، بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤ خۆی ئامادە بکات بۆ گەشت و ماڵئاواییکردن لە خزمان و خۆشەویستان؛ چونکە دەرفەتەکان لە گۆڕانکارییدان و، لە وڵاتێکی دیاریکراودا بەجێگیری نامێننەوە، بۆیە لە ئایندەدا دامەزراوی و دینداری سەنگێکی یەکجار زۆری دەبێت، هەروەها دەرفەتەکانی بڵاوکردنەوەی ئاینی خوا و بانگەوازکردنیش سەنگ و بەهایەکی زۆری دەبێت. هەمیشە ئەوە گرنگ نییە بزانین چ

شتێك لەوانەیە ڕووبدات، بەڵكو گرنگ ئەوەیە كە خۆمان ئامادە بكەین بۆ مامەڵەكردن لەگەڵی و، هەر ئەمەشە كە دەبێت خەمی منداڵەكانی لەسەر بخۆین.

د. كوڕان و كچانمان ـ خوا یار بێت ـ لە ئایندەدا خێزان پێكەوە دەنێن و، منداڵ دەخەنەوە و بەرپرسیاریەتی پەروەردەییان بۆ دروستدەبێت، جا ئامادەكردنیان بۆ تەواوی ئەو شتانە بەشێكی گرنگی ئەركەكەمانە. ئەوەشمان لەیاد نەچێت كە دایكان ڕۆڵێكی مەزن دەگێڕن لە پەروەردەكردن و ئامادەكردنی كچەكانیان تاوەكو ببنە دایكانێكی دڵسۆز، زۆر جاریش لەو ڕۆڵەیاندا سەركەوتوو دەبن، بەڵام سەردەم گۆڕانكاریی بەسەردا دێت و، پێویست بەوە دەكات ڕۆڵەكانمان بە شێوەیەكی زۆر باش ئامادە بكەین. گرنگ ئەوەیە كچان و كوڕانمان هۆشیارییان دەربارەی سروشتی ژیانی خێزانداری بۆ دروست ببێت و، بزانن كە ئەو ژیانە لەسەر سازشكردن و سازان و لێكتێگەیشتن و بەرخودان وەستاوە، نەوەك لەسەر دەمەقاڵێ و شەڕ و ئاژاوە، هەروەها بزانن كە پەیوەندی نێوان هاوسەران لەسەر بنەمای جیاوازی وەستاوە، نەوەك هاوتایی، بەو واتایەی كە لەسەر هەر كام لە هاوسەرەكان پێویستە لەسەر ئەو بنەمایە مامەڵە لەگەڵ هاوژینەكەیدا بكات كە كەسایەتییەكی جیاوازە، بشزانن كە مێرد خزم و كەسوكاری هەیە و مافیان بەسەریەوەیەتی، ژنیش ـ دیسان ـ خزم و كەسوكاری هەیە و وەك ئەو مافیان بەسەریەوە هەیە، بۆیە پێویستە

هەر یەك لە جێی خۆیەوە هاوکاری هاوژینەکەی بێت لە پێدانی ئەو مافەی بەسەریەوەیەتی، هەروەها دەشێت فڵان و فیسار و ئەمانە و ئەوانە دەستوەربدەنە پەیوەندی ژن و مێردەوە، بۆیە پێویستە لەو کاتانەدا بەهاوکاری هەردوو لایان ڕێگە نەدەن کەسانی تر ژیانیان لێ تاڵ بکەن.

## ٢. تێدەکۆشین تاکو خێزانێکی سەرکەوتوومان لێهەڵبکەوێت:

تاك بنچینەی خێزانی موسوڵمانە و، خێزانی موسوڵمانیش بنچینەی کۆمەڵگەی موسوڵمانە، سەرکەوتنی خێزانیش گەورەترە لە سەرکەوتنی تاك؛ چونکە زۆر خێزان هەن کەسانی سەرکەوتوو و بەناوبانگیان تێدا هەڵکەوتووە، کە ئەمە شتێکی باشە، بەڵام ئەوەی گرنگە سەرکەوتنی ئەو خێزانەیە بە هەموو مانایەك، واتە خێزانێکی ئاسوودە و بەختەوەر بێت، پەیوەندی نێوان تاکەکانی پتەو بێت، ڕۆڵی لە ناو کۆمەڵگەدا دیار بێت. کۆمەڵگەکەمان پێویستییەکی زۆری بە ژمارەیەکی زۆر تاك و خێزانی سەرکەوتوو هەیە؛ چونکە بە دەست چەندین کێشە و گیروگرفتەوە دەناڵێنێت و، شوێن و پێگەی لە نێو نەتەوەکانی دونیادا لە ئاستی شایستەی خۆیدا نییە، پێم خۆشە لە خوارەوە ئاماژە بە چەند خاڵێك بدەم دەربارەی مەبەستمان لە سەرکەوتنی خانەوادەی موسوڵمان:

أ. دەستگرتن بە ڕێنماییەکانی شەریعەتی ئیسلام بەدڵ و بەگیان ـ بە پشتیوانی خوا ـ دەبێتە مایەی سەرکەوتن لە ژیانی هەردوو دونیادا، بیهێننە پێش چاوی خۆتان ئەندامانی خێزانێك پابەندبن بە کار و ئەرکە شەرعییەکانەوە و، هیچ کام لە تاکەکانی ئالوودەی جگەرەکێشان و مادە هۆشبەرەکان نەبێت و، گەورە تێیدا بەزەیی بە بچووکدا بێتەوە و، بچووکیش تێیدا ڕێزی گەورە بگرێت و، شەوان زوو بنوێت و، خێزانێکی ئاسوودە و ئارام بێت و، خەمی کار و کاتەکانی بخوات و، ڕێز لە یاسا و زانست بگرێت.. دەبێت حاڵی چۆن بێت؟ بێگومان بەو تایبەتمەندییانەوە لە سەر ڕێگەی ڕاستە و، هەنگاو بەرەو پێشکەوتن و سەرکەوتن دەنێت؛ من بۆ خۆشم بڕوای تەواوم بەوە هەیە کە هەر کارێك گوێڕایەڵی خوای تێدا بێت، پێشکەوتن و سەرکەوتن بەدوای خۆیدا دەهێنێت، هەروەها هەر کارێك سەرپێچی و یاخیبوونی خوای پێوە دیار بێت، شکست و دۆڕان بەدوای خۆیدا دەهێنێت، ئەوەش تەرازوویەکە دەکرێت هەموو کارەکانی تری پێ بکێشین.

ب. ئیشوکاری بەردەوام و لەسەرخۆ و دەستکەوتی نەبڕاوە و، سەرسامبوون پێی و، هاندانی تاکەکان لەسەری و پاداشتدانەوەیان و... تەواوی ئەو شتانە نەریتی خێزانی سەرکەوتوون. بۆیە هەر بەرەوپێشەوەچوونێك لە لایەن هەر تاکێکی خێزانی موسوڵمانەوە بەدەست بێت دەستکەوتێکی گەورەشە بۆ خێزانەکە، کەوابوو

ویستە تەواوی ئەندامانی ئەو خێزانە دڵخۆشی خۆیان بەو
ستکەوتانە دەربڕن کە هەر تاکێکی ئەو خێزانە بەدەستیان
هێنێت، لای ئێمەش ڕوونە کە مرۆڤ ئەگەرچی توانایەکی زۆریشی
بێت و سەرکەوتنی گەورەشی بەدەست هێنابێت و، بڕوای زۆریشی
خۆی هەبێت، هێشتا هەر پێویستی بە سوپاس و پێزانین هەیە،
ێمەش نابێت کەمتەرخەمی لەو شتەدا بکەین.

ج. چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێو خێزان بەبێ
دەستێوەردانی دەرەکی: ئەمەش یەکێکی دیکەیە لە ئەرکەکانی
خێزانی موسوڵمان و سەرکەوتوو. هەموو ماڵێک کێشە و ناکۆکی
تێدایە، بەڵام خێزانی سەرکەوتوو ئەو خێزانەیە کە بە کێشە و
سەرئێشە دروستکردن دۆست و هاوڕێیان هەراسان ناکات. ئەرکی
سەرشانی دایکان و باوکانە بە پلەی یەکەم بەم کارە هەستن و
پاشنیش منداڵە گەورەکان، پێشم وایە بەهەندوەرگرتنی ڕووداوەکانی
ناو خێزان و بەدواداچوونی بەردەوام بۆ گۆڕانکارییەکانی بەس بێت بۆ
بەدیهێنانی ئەوە.

د. هەوڵدان بۆ نیشتەجێبوون لە ناوچەیەکی باشدا،
مەبەستیشمان لەوە پۆزلێدان و خۆجیاکردنەوە نییە، بەڵکو
مەبەستمان ئەوەیە مرۆڤ لە شوێنێکی کاول و وێراندا نیشتەجێ
نەبێت، بۆ نموونە ناوچە ناخاوێن و ناتەندروست و بێ سەرپەرشتەکان
ژینگەیەکی نموونەیین بۆ بڵاوبوونەوەی تاوان و کاری بەدڕەوشتی و

بەکارهێنانی مادە هۆشبەرەکان و هەموو جۆرە نەخۆشییەك، هەندێ شوێنیش دانیشتوانەکەی خوویان بە شتانێکی خراپەوە گرتووە، هەندێکێشیان سادەترینی خزمەتگوزارییەکانیان تێدا بەدی ناکرێت.
جێی خۆیەتی لێرەدا ئاگامان لە شتێکی دیکە بێت، ئەویش بریتییە لە بوونی قوتابخانە و خوێندنگە و زانکۆی بەهێز و سوودبەخش، دیارە قوتابخانە لاوازەکان کاریگەریی خراپی لەسەر مێشك و خووڕەوشت و ئایندەی منداڵ دەبێت و، کەسایەتی لەکەدار دەکات؛ لە دێر زەمانیشەوە تا ئەمڕۆ خێزانە خەمخۆرەکان منداڵەکانیان بە مەبەستی فێربوون لە گوند و شارۆچکەکانەوە دەنێرن بۆ شارە گەورەکان، بێگومان ئەمەش کارێکی گەورەیە و جێگەی ڕێز و پێزانینە.
هـ. تاوەکو خێزان سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، دەبێت ورەبەرزی و کۆڵنەدان و جدییەت بکاتە خەسڵەتێکی گشتی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ شتەکان، خوای گەورەش بەڵێنی لە بەنی ئیسرائیلیەکان وەرگرت کە بە هیممەت و ورەیەکی بەرزەوە پەیڕەوی لە تەورات بکەن، خوا گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ البقرة: ٦٣.
واتە: (ئەی بەنی ئیسرائیلەکان یادی ئەوە بکەنەوە کە پەیمانم لێ وەرگرتن و بەڵێنتان دامێ کە پەیڕەویی مووسا بکەن، ئەوەبوو کێوی توورم بەسەردا بەرزکردنەوە تا پەیمانەکەتان قبووڵ کرد و، پێم وتن:

ئەو کتێب و پەیمانە توند وەربگرن و بەو حوکمانە وان لەناویدا ڕەفتار بکەن، بەڵکو لە ئازاری ڕۆژی سزا بپارێزرێن).

جدییەت و خەمخۆریی واتە گرنگیدان بە هەموو شتێك و، وردبینیکردنی گەورە و بچووك، ئەوە باوکێکە بیستبوویەوە کە منداڵەکەی هاوڕێیەتی کۆمەڵێك گەنجی سەرەڕۆ دەکات، بۆیە خەمساردی نەنواند و، لەگەڵ کوڕەکەی دانیشت و، پێی وت: کوڕم ئەو کەسانە کێن کە لە هەفتەیەکدا دوو سێ جار لەگەڵیان دەچیتەدەرەوە؟ کوڕە لە وەڵامدا وتی: کوڕانی گەڕەکەکەمانن، ژمارەیەکیشیان هاوڕێی قوتابخانەمن. پاشان باوکی پرسیاری لەبارەی ناو و خانەوادە و کەسوکاریانەوە کرد، هەوڵیدا بۆچوون و تێڕوانینی خەڵکییان لەسەر وەربگرێت، وەختێك بۆی دەرکەوت خەڵکانێکی ناوبانگ خراپن، ڕاشکاوانە لەگەڵ منداڵەکەی قسەی لەسەر بابەتەکە کرد و، ڕێککەوتن کە لە ماوەی سێ هەفتەدا کۆتایی بەو پەیوەندییە بهێنێت.

هەروەها جدییەت بە واتای ئەوە دێت کە بە بایەخەوە گوێبیستی قسە و داوای منداڵەکان بیت و، هەوڵبدەیت لە کێشە و گیروگرفتە جیاوازەکانیان بگەیت؛ چونکە لەوانەیە منداڵ بەدەست چەندین کێشە رگیروگرفتەوە بناڵێنێت، بەڵام لە تاو شەرم کەس شك نەبات دەردەدڵی خۆی لا باس بکات، دەترسێت لەگەڵ دایك و باوکیدا لەو بارەیەوە قسە بکات، کەواتە لەسەر دایك و باوك پێویستە بزانن چ

شتێك بووەتە مایەی نیگەرانی و بێزارکردنی منداڵەکەیان، سەربارەی ئەوەش: ئەستەمە هیچ خێزانێك بە خێزانێکی جددی و بەئاگا و خەمخۆر هەژمار بکەین، ئەگەر بێتو بەهای کاتی لە لا وەك بەهای پارەی دەستی کەسی ڕژد و چرووك نەبێت. جدییەت لە قۆستنەوەی کاتدا بەواتای بیرکردنەوە دێت لەو شێوازی کارکردنەی کە مرۆڤ لە میانەیدا لە ماوەیەکی کورتدا دەتوانێت بەرهەمێکی زۆر و زەبەند بەرهەم بهێنێت، هەروەها بە واتای کەمکردنەوەی کاتەکانی نووستن و کاتەکانی سەرقاڵبوون بە کاری لاوەکییەوە بۆ کەمترین ئاست دێت، یان بە گوێرەی پێویستی، هەروەها جدییەت و خەمخۆریی واتە: ڕێکخستنی کارە لە پێشینەکان و، نەکوشتنی کات لە شتە پووچ و بێ ماناکاندا و، لە دەستنەدانی شتە گرنگەکان.

ئەو خێزانەی بایەخ بە کات بدات، ئەندامەکانی بە گیانی تیم هاوکاری یەکتری دەکەن لە سوود وەرگرتن لە کاتەکانیان.

و. خێزانی سەرکەوتوو لەم سەردەمەماندا بریتییە لە خێزانی فێربوو و تێگەیشتوو، ئێمە ئەمڕۆ پێویستمان بە فێرکردنێکی نایاب هەیە کە بە پێی پێوەرە جیهانییەکان دانی پێدا نرابێت، نەوەك بەپێی پێوەرە خۆجێیەکان.

لە سەرەتادا ئەوەی پێویستە ئەوەیە کە دایکان و باوکان ئەو ڕاستییە باش بزانن کە سەرمایەی نەوەی نوێ ئەو زانست و زانیارییە پێشکەوتووە و، ئەو ڕاهێنانە باشەیە کە هەیەتی، پاش ئەوەش

پێویستە لەسەریان کە پلان دابنێن بۆ دابینکردنی پارەی پێویست بۆی، بێگومان ئەمڕۆ خوێندنی نایاب و ئاستبەرز خەرجیی زۆری دەوێت.

بۆیە لەسەر خێزان پێویستە هاوکاریی ڕۆڵەکانیان بکەن بۆ گەشتکردن لە پێناو کاری فێرخوازی، بۆیە ئەوەش دەڵێم، چونکە زۆر خێزان هەن ڕێگە بە منداڵەکانیان نادەن گەشت بکەن بۆ دەرەوەی وڵات چ لەبەر ئەوەی بێ ئەوان نایان کرێت و، چ لەبەر خەمی فەوتانیان بێت. هەڵبەت ترس لە فەوتانیان شتێکە لە جێی خۆیدایە و تێی دەگەین، بەڵام خۆ دەبێت بە دوای گەشتێکی ئارامدا بگەڕێین بۆ منداڵەکانمان تاوەکو مەودای تێگەیشتنیان فراوانتر بێت و، زانست و زانیاریی نوێ و پێشکەوتوو لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە وەربگرن.

ز. لە تەك خوێندن و فێربوون لە جێگەیەکی باشدا شتێکی دیکە هەیە، ئەویش گەشەدانە بە توانا و بەهرەی ڕۆڵەکان، ئەوەش پرسێکە لەوپەڕی گرنگیدایە، بێگومان هەموو منداڵێك خاڵی بەهێز و بەهرەداری لە شتێکدا هەر تێدایە، جا کاتێك ئەو بەهرەیە دەدۆزینەوە و، گەشەی پێدەدەین و، هانی دەدەین لەسەری، ئەوا بەو کارەمان - پشتیوان بە خوا - ڕێگای سەرکەوتن و ناوداریێتی بۆ خۆش دەکەین و، خزمەتێکی پێشکەش دەکەین کە هیچ خزمەتێکی تری پێنەگات.

زۆر جار منداڵ لە تەمەنی سیازدەساڵیدا بەهرەیەکی دیاریکراوی تێدا دەردەکەوێت، یان حەز و خولیای بۆ بابەتێك یان پسپۆڕییەك

دەجوولێت، لەو کاتانەدا پێویست دەکات هانی بدەین و، پشتیوانیی خۆمانی بۆ دەربڕین. لێرەدا شتێکی گرنگ هەیە نابێت لە یادمان بچێت، ئەویش ئەوەیە کە بزانرێت گرنگ جۆری ئەو پسپۆڕییە نییە کە لاوەکە ئارەزووی دەکات، بەڵکو ئەوەی گرنگە پێگە و شوێنی ئەو پسپۆڕییەیە لە داهاتوودا، بۆ نموونە کارگێڕێکی لێزان زۆر لە پزیشکێکی ئاسایی باشترە و، مێژوونووسێکی بەتواناش لە دە ئەندازیاری ئاسایی باشترە... بەو شێوەیە.

ئەگەر خوای گەورە منداڵێکی بەهرەمەندی بەخشییە خێزانێک، ئەوا با دایک و باوکەکە پەرتووکێك یان دوان لەسەر شێوازەکانی گەشەدان بە کەسانی بەهرەمەند بخوێننەوە و، لەگەڵ مامۆستاکانیشیدا هەماهەنگی بکەن و، پێکەوە گرنگی تایبەتی پێبدەن، با باوکیشی هەوڵبدات دایبنیشێنێت لەگەڵ ئەو مامۆستایانەی کە توانایەکی باشیان لەو خولیا و پسپۆڕییە هەیە کە لەودا دەرکەوتووە، چونکە ئەوە هێندەی تر دڵخۆشی دەکات و هەڵی دەنێت بۆ پێشەوە، جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بەوە بدەین کە لەسەر دایکان و باوکان پێویستە بە ڕۆڵی خۆیان و قوتابخانەکانیش هەڵبسن لە دۆزینەوە و گەشەدان بە بەهرەکانی منداڵەکانیان، چونکە زۆر بە داخەوە زۆربەی قوتابخانەکانمان نەیاتوانیوە ئەو ڕۆڵە بگێڕن!

## ٣- کاروباری خۆمان بە باشترین شێوە ڕاپەڕێنین:

ئەرکی گەورە و گرانمان لەم ژیانەدا گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی خوای گەورە و، چاکەکردنە لەگەڵ خەڵك و، بڵاوکردنەوەی خێر و چاکەیە لەسەر زەوی، جا بۆ ئەوەی بە تەواوی بەم کار و ئەرکە مەزنانە هەستین سەرەتا پێویستمان بەوەیە کاروباری ژیانی خۆمان بە باشترین شێوە ڕاپەڕێنین. مرۆڤ کاتێك برسێتی و ماندوویەتی زۆری بۆ دەهێنن، یان کاتێك قەرزدارە و خاوەن قەرزەکان لە کۆڵی نابنەوە، یان کاتێك دەستبەئەژنۆ لەبەردەم کێشە و گیروگرفتەکاندا ڕادەوەستێت، بێگومان ناتوانێت بە ئارامی و ئاسوودەیی و دڵسۆزیی تەواو بۆ پەروەردگار ئەو کارانە ئەنجام بدات، هەروەها ناتوانێت بەشداری لە چالاکییە خێرخوازییە گشتییەکانیشدا بکات، ناشتوانێت پەیوەندیی خزمایەتی بەجێ بهێنێت و، چارەسەری کێشەکانی خزم و دۆست و دراوسێ و هاوڕێیانی بکات. خێزان کاتێك چارەسەرکردنی کێشە و گیروگرفتە ناوخۆییەکانی پێناکرێت، خۆی دەبێتە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی، لێرەوە؛ دێینە سەر باسی یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی ڕێڕەوی ژیانی خێزانی موسوڵمان، کە بریتییە لە: ڕاپەڕاندنی کاروباری ژیان و گوزەرانی ماددی خۆی بە تایبەتی، کە بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

أ. ڕزق و ڕۆزیی بەندەکان بەش بەش کراوە و بڕاوەتەوە، ئەمەش مانای وا نییە پاڵ بدەنەوە و کار نەکەن، نەخێر بەڵکو دەبێت کۆڵنەدەن و بەردەوام لە هەوڵی بەدەستهێنانی ئەو بەش و ڕۆزییەی خۆیاندا بن کە خوا بۆی بڕیونەتەوە، بۆ ئەوەش دەبێت سووربین لەسەر کاسبی حەڵاڵ و، خۆمان بەدوور بگرین لەو سەرچاوە داراییانەی جێگەی گومانن.

ب. ئێمە خۆمان و هەرچییەکیش کە هەمانە موڵکی خوای گەورەین، بۆیە پێویستە ئەو شتانەی هەمانن بە گوێرەی یاسا و شەریعەتی خوا بەکاریان بهێنین، جا وەك چۆن کەسمان بۆی نییە دەستی خۆی ببڕێت و فڕێی بدات، بە هەمان شێوەش بۆی نییە پارە بەفیڕۆ بدات و تەخشان و پەخشانی بکات، خوای گەورە دەربارەی ئەو کەسانەی پارە بەفیڕۆ دەدەن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا۟ إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا﴾ الاسراء: ٢٧، واتە: (بەڕاستی ئەوانەی ماڵی خۆیان لە شتی ناپێویستدا خەرج دەکەن برای شەیتانەکانن و شەیتانیش زۆر کافر و نافەرمانبەرداری خودای خۆیەتی).

لە ڕاستیدا کاتێك لە دەرگای ئارەزووەکان دەدەین و، باس لە تێرکردنی حەزەکان دەکەین و، شوێن هەوا و ئارەزووەکانی دەروونمان دەکەوین، ئەوە بابزانین کە نەفس و ئارەزووی مرۆڤ تێربوونی نییە. ئەو کەسە ڕاستی فەرمووە کە وتوویەتی: چی

بەخششی سەر زەوی هەیە بەشی دابینکردنی پێداویستییەکانی هەرچی خەڵکە دەکات، بەڵام بەشی تێربوونی ئارەزووەکانی تەنها کەسێك ناکات!

پێویستە دایك ڕۆڵێکی کارا ببینێت لە ڕێگریکردن لە بەفیڕۆدانی پارە و، دەستگرتن بە خەرجییەوە و، هاندانی پیاو لەسەر خەرجنەکردنی پارە بۆ شتانێك کە زیادەن و خێزانەکە پێویستی پێیان نییە.

ج. خێزانی موسوڵمان بە چاوی بەندایەتی و نزیکبوونەوە لە خوا دەڕوانێتە کار و کاسبی و دابینکردنی بژێوی ژیان، بێگومان ئەو کاسبییەش دەبێت حەڵاڵ بێت و سنوورەکانی خوای تێدا پارێزراو بێت، واتە گزی و فرت و فێڵی تێدا نەبێت و، ویژدانی خۆتی پێ ئاسوودە بکەیت، هاوکات دەبێت وریای ئەوە بیت کە کار و کاسبی دونیا سەرقاڵت نەکات و، ئەرکە ئایینیەکانت بیر نەباتەوە. کەوابوو ئەرکی سەرشانی دایکان و باوکانە منداڵەکانیان لەسەر خۆشویستن و ڕێزگرتن لە کات پەروەردە بکەن و، بەجۆرێك بەتاڵیی و بێکارییان تێبگەیەنن کە پەڵەیەکی ڕەشە لە ژیانی مرۆڤی موسوڵمان، بۆیە پێویستە هاوکاریی منداڵەکانیان بکەن و هانیان بدەن لە کاتی پشووی خوێندنگە و زانکۆکاندا دەست بکەن بە ئیشێك، تاوەکو پارە پاشەکەوت بکەن، هەروەها فێری ڕاپەڕاندنی چەندین کاری بەسوودیان بکەن.

شیاوی باسکردنه لێرەدا ئاماژە بە فەرموودە شیرینەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بدەین، کە لەبارەی بێکارییەوە فەرموویەتی: ((نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ: الصِّحَّةُ وَالْفَرَاغُ)) واتە: ((دوو بەهرەی گەورە هەن زۆر کەس بەرهەمیان ناهێنن و دەستەخەڕۆ و دەستەشکێن بوون بەهۆی ئەو پشتگوێ خستنەوە: یەکەم تەندروستی و لەشساغی، کە دەبێت بەندە ئەو هەلە لە دەست خۆی نەدات و خەریکی کاری باشە بێت، دووەم: دەستبەتاڵیی، کە ئەمیش هەروەها))[1].

د. بەخشین و چاکەکردن و سیلەی ڕەحم دەرگایەکە لە دەرگاکانی ڕزق و ڕۆزی، بۆیە کاتێک دەکەوینە تەنگانەوە، ئەوا لە خوا دەپاڕێینەوە بەهانامانەوە بێت و، لە میانی بەخشین و هاوکاریکردنی هەژارانەوە دەرووی خێرمان لێبکاتەوە.

هـ. هەوڵبدەین پاشەکەوتێکمان هەبێت، گەر بێتو سەرنجێکی ئەو کێشانە بدەین کە بەهۆی دەوڵەمەندییەوە دروستدەبن و، ئەو کێشانەشی بەهۆی هەژارییەوە دروستدەبن، ئەوا بۆمان ڕووندەبێتەوە کێشەکانی هەژاری زۆر لە کێشەکانی دەوڵەمەندی زیاترن، لەوانە: سواڵکردن و دەستپانکردنەوە لە خەڵکی و، ئیرەیی بردن بەو شتانەی خوا پێی داون و، خۆبەکەمزانی و سەرشۆڕکردن و، بەشدارینەکردن -

---

١- بوخاری: ٦٤١٢

بەهۆی کەمدەستییەوە - لە پڕۆژەکانی خێرخوازی و بەهاناوەچوونی هەژاران.

دەوڵەمەند و هەژار هەردووکیان لەبەردەم ڕەحمەتی تاقیکردنەوەدان، باشترینیشیان ئەوەیانە زۆرتر لە خوا دەترسێت و، ئارامگرترە لەبەردەم ئەو شتەی پێی تاقی دەکرێتەوە، بێگومان ئوممەتی ئیسلامیش هەژاریی بەسەریدا زاڵە، جا ئەگەر بیەوێت دام و دەزگای گەورەی زانستی و پیشەسازی بنیات بنێت، ئەوا پێویستی بە پارە دەبێت، پارەش چۆن بەدەست دێت ئەگەر زۆربەی خەڵکی لە هەژاریدا ژیان بگوزەرێنێت؟

لە پێناو ئەوەی داهات و دەرامەتمان گەشە پێ بدەین، دەبێت هەوڵبدەین ئیش و کارەکەمان پەرە پێبدەین و، لە کاتی پێویستدا کارێکی تر بکەین و، هەوڵبدەین داهێنان بکەین تاوەکو پارەی پێ بەدەست بخەین و، قەرز نەکەین بۆ کڕینی شتی جوانکاریی و ناپێویست و، هەوڵی پاشەکەوتکردنی بەشێکی داهات و مووچەکەمان بدەین بۆ کاتی تەنگانە تا دەست بۆ خەڵکی پان نەکەینەوە و، کار بکەین بۆ دەستگرتن بەم یاسا ئاڵتوونییەوە: ((پێویست نەبوون و وازهێنانت لە شتێکی ناپێویست باشترە لەوەی کە هەتبێت))، بۆ نموونە ئەگەر مێز و کورسییەکمان بەس بوو، ناچین دوو مێز و کورسی بکڕین، ئەگەر پێویستیشمان بە پێنج ژوور بوو ناچین خانوویەکی حەوت ژووری دروست بکەین.

و. هەوڵبدەین لە بری بەرهەمە هاوردەکان، بەرهەمە نیشتیمانی و خۆماڵییەکان بەکاربەرین - ئەگەرچیش کوالێتییان نزم بێت - لە پێناو پەرەدان بەو بەرهەمانە و، هێشتنەوەی سەرمایەی نیشتمان لە نێوخۆی وڵاتدا، هەروەها گەشت و سەیرانەکانیشمان لە ناو وڵاتە ئیسلامییەکاندا دەهێڵینەوە بۆ هەمان مەبەست.

ز. هەوڵدەدەین کێشی لەشمان زیاد نەکات و بەشێوەی مامناوەند و ئاسایی بمێنێتەوە و، دژی قەڵەوی بوەستینەوە و، بە پێی پێوەرە پزیشکییەکان خۆراکمان هەڵبژێرین و، هەر تاکێکی خێزانەکەش خۆی لەسەر ئەوە ڕابهێنێت کە زۆر نەخوات، تا گەدەی پڕ نەبێت.

ح. هەر تاکێکی خێزان ئەو وەرزشەی لەبارە بۆی ئەنجامی بدات و هاوکاری یەکتر بین لەو کارەدا.

گ. ئەگەر هەر کامێکمان ئیشەکەی نەما؛ ئەوا با لەماڵەوە پاڵی لێنەداتەوە، بەڵکو با پەرە بە زانیاریی و کارامەییەکانی بدات، یاخود کارێکی کاتی بکات تا ئەو کاتەی کارێکی گونجاوی بۆ هەڵدەکەوێت.

ی. توخنی مادە هۆشبەر و چالاککەرەوەکان نەکەوین و، بە گژ هەموو شێوەکانی ئاڵودەبووندا بچینەوە و، هەوڵبدەین ژیانێکی ئاسوودە و بەختەوەرانە بژین و، بەرهەمە سروشتییەکان بەکاربهێنین.

ك. ڕەوشت و ئاکار و ڕەفتار و هەڵسوکەوتە جوانەکان سەرچاوەیەکی گەورەی خۆشبەختی و کامەرانین و، دەرگایەکیشە لە

دەرگاکانی ڕزق و ڕۆزی و، ڕەوشتبەرزی تای تەرازووی کردەوەکانمان لە ڕۆژی دواییدا سەنگین دەکات، لەبەر ئەوە بە خووڕەوشتی جوانی ئیسلام پەیوەندی و ڕەفتارەکانمان لەگەڵ خەڵکیدا دەنەخشێنین.

ئەمە ئاماژەیەکی خێرا بوو بۆ ئەو شتانەی کە دەتوانین کاروبار و گوزەرانی ژیانی ڕۆژانەمانیان پێ ڕێکبخەین، پێم باشە خێزانە بەڕێزەکان چەند کتێبێك لەو کتێبانە بخوێننەوە کە وردەکاری و زانیاریی زیاتریان لەوبارەیەوە پێدەدات.

## ٤- زیاد لە پێویستییەکانی خێزانەکان:

کاتێك خێزانی موسوڵمان کاروبارەکانی بەشێوەیەکی باش ڕێکدەخات و، سەرکەوتوو دەبێت لە چارەسەرکردنی زۆربەی کێشە و گیروگرفتەکانی ژیاندا، ئەوسا ئیتر دەبینێت کات و توانا و پارە و هزر و زانستی زۆری بۆ دەمێنێتەوە کە دەتوانێت لە بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگە و، بەرژەوەندیی بەندەکان و، چارەسەرکردنی چەندین کێشە لەو کێشانەی موسوڵمانان بەدەستیەوە گیرۆدە بوون بەکاریان بهێنێت.

ڕێگەم پێبدەن تا لێرەدا ڕاشکاوانە بۆتان بدوێم، ئەوەی ڕاستی بێت من هەستدەکەم خێزانە موسوڵمانەکان - جگە لەوانەی خودا بەزەیی پێیاندا هاتووەتەوە - لەم بابەتە بەدوورن، واتە هەستی بەشداریی چاکسازی و، بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگە و هاوکارییکردنیان

تا ڕادەیەك تێدا نەماوە، لە کاتێکدا نیەتی موسوڵمان زۆربەی کات نیەتێکی خێرۆمەند و مرۆڤدۆستییە، جاریَ لەسەر ئاستی پەروەردەی خێزان و، ئاستی بزاوتی مەیدانی تا بڵێی خراپە، بۆیە دەبینیت بەلای تەواوی خەڵکیشەوە قسەکردن لەو بارەیەوە بووەتە شتێکی نامۆ و خەیاڵی و ناکارا! بێگومان ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ لاوازیی پەروەردەی کۆمەڵایەتی لە ناوماڵەکانماندا؛ چونکە لە پرۆسەی پەروەردەکردنەکەماندا بەشێوەیەکی بێسنوور جەخت دەکەینەوە لەسەر بەرژەوەندی منداڵەکان و بەرژەوەندیی خێزانەکە، لەبەر ئەوە دەبینیت هەستی چاکەخوازی و هاوکاری و بەهاناوەچوون و بەشداریی کۆمەڵایەتی بە زۆریی تا بڵێی لاوازە، لە کاتێکدا کاری هەرەوەزی بە گشت جۆرەکانییەوە سەرچاوەیەکە بۆ ئاسوودەیی دڵ و دەروون و، هاوکات هۆکارێکیشە بۆ پاککردنەوەی دەروون لە ژەنگ و ژاڵی خۆپەرستی و بەرژەوەندیی تایبەتی بێسنوور.

**چەند شێوازێکی کەڵك وەرگرتن لەو شتانەی زیاد لە پێویستی خێزانن:**

**١- کارکردنی بەردەوام بۆ خۆشی و شادیی خستنە نێو دڵی خەڵکییەوە.**

باوەڕ موسوڵمان هەڵدەنێت بۆ دڵخۆشبوون بە چاکەکردن لەگەڵ خەڵك و دابینکردنی پێداویستییەکانیان، دیارە هەستکردنی مرۆڤ بە

ئارامی و دەربڕینی هاوسۆزی و هاوخەمی بۆی و، ئاسوودەکردنی دڵ و دەروونی و، گرنگیدانی خەڵکی بە خەم و ئاواتەکانی، ئەمانە و چەندینی تر نموونەی پێداویستییە سەرەکییەکانی ئەون.

لە ڕاستیشدا خوای گەورە دڵی وەها دروستی کردووە کە بە سادەترین هۆ ئاسوودە و کامەران دەبێت، دایکێک هەبوو بە ڕۆڵەکانی دەوت: "ئەگەر بە دیداری کەسانێک شاد بوون و، لە تواناتاندا بوو بزە رخەندە بخەنە سەر لێوەکانیان، ئەوا سێ و دووی لێ مەکەن"، مەبەستەکەشی بە نموونەی زیندوو بۆ ڕووندەکردنەوە: ئەگەر کەسێکتان چووە مزگەوتەوە و کەسێکیش لە دوایەوە بوو، ئەوا دەرگاکە پێوە مەدە تا ئەو کەسە دێتە ژوورەوە، ئەگەر یەکێکیشتان ویستی لە ماڵ یان لە مزگەوت بڕواتە دەرەوە و کەسێك لە لای ڕاست یان لە لای چەپیەوە بوو، ئەوا با ڕێزی لێبنێت و لە چوونەدەرەوەکەدا پێش خۆی بخات، ئەگەر کەسێکیشتان بینی گیری بەدەست کۆڵێکەوە خواردبوو یان سەری لە چارەسەری شتێك دەر نەدەکرد، ئەوا بچن بە دەمییەوە و هاوکاریی بکەن. بە ڕاستی دایکێکی خەمخۆرە و هیواخوازم دایکە بەڕێزەکان چاو لەو ئافرەتە بکەن!

دەگێڕنەوە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت - دەچووە دەرەوە بۆ بازاڕ، بەڵام نەك بۆ شت کڕین، بەڵکو بۆ سەلامکردن لە خەڵك و، هەواڵ پرسینیان، سەرنج بدەن چۆن کاتی

زیادەی خۆی لە پرسینەوە لە خەمی خەڵك و دڵخۆشکردنیاندا بەسەر دەبات.

**٢- ئامۆژگاریکردنی موسوڵمانان بە گەورە و بچووکەوە بوارێکی باشە بۆ بەگەڕخستنی ئەو توانا و دەرفەتە زیادەی خێزان.**

ئامۆژگاری و قسەی خێر ڕێنوێنیکردنی خەڵك و، کارئاسانیکردن بۆیان و، فەرمان بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە دەگرێتەوە، چەند خۆشە موسوڵمان هەست بەوە بکات کە تەنها نییە لە ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکاندا، بەڵکو کەسێك هەیە هاوخەمی بۆ دەرببڕێت و هاوکاریی بکات، هەر لەبەر گرنگی ئەم بابەتەش بوو پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) بەیعەتی لە ژمارەیەك هاوەڵی وەردەگرت لەسەری، لە نموونەی ئەو بەسەرهاتەی کە لە جورەیری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلییەوە گێڕراوەتەوە، دەڵێت: ((بَايَعْتُ رَسولَ الله ﷺ عَلَى إِقَامِ الصَّلاَةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ والنُّصحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ)) واتە: ((بەڵێن و پەیمانم دا بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لەسەر ئەوە کە نوێژ بکەم و، زەکات بدەم و ئامۆژگاری خێری هەموو موسوڵمانێکیش بکەم)).[١]

لە گێڕانەوەکەی ئەبی هورەیرەشدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: ((حَقُّ المُسْلِمِ عَلَى المُسْلِمِ ست: ... وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ...)). واتە: ((بە یاسای شەرع

---

١- بوخاری: ٥٧، موسلیم: ٥٦

موسوڵمان شەش مافی تایبەتی لەسەر موسوڵمان هەیە:) ؛ یەکێك لەوانە فەرمووی: ((کاتێك داوای ئامۆژگاری لێ کردیت ئامۆژگاری باشی بکە...))[1]. مندالآن زۆر جار لە کاروباری سەعیکردن و تاقیکردنەوە و کڕینی پۆشاك و کەلوپەلی جوانیدا پرس و ڕاوێژ بە یەکتری دەکەن، هەروەها زۆر جار چەند ئاکار و ڕەفتارێکی نەشیاو و نابەجێ لە یەکتریدا بەدیدەکەن، هەمیشە لەم جۆرە حاڵەتانەدا پێویستە قسەی خێر بکرێت.

مندالآن ئەم جۆرە خووڕەوشت و ڕەفتارانە لە هەڵسوکەوتی باوك و دایکیانەوە فێردەبن، زۆربەی کاتەکانیش ئەوەی دەیڵێین بەپێچەوانەوە دەشکێتەوە: ئەوە کچێکە بە باوکی دەڵێت: "فلآنە هاوڕێم بە پلەی یەکەم دەرچوو"، باوکیشی لە وەڵامدا پێی دەڵێت: "دەرچوون یان نەبێت یان دەبێت ئاوها بێت". لەم جۆرە هەڵوێستانەدا کچەکە پەنا دەباتە بەر کەمکردنەوەی بەهای دەرچوونی هاوڕێکەی، یان دەڵێت: "من نەبوومایە ئەو پلەیەی بەدەست نەدەهێنا"، یان بە چاوی پیسەوە تەماشای هاوڕێکەی دەکات و، ڕەنگە گۆبەندێکیشی بۆ بنێتەوە... بۆیە پێویست بوو باوکەکە بڵێت: "ماشەڵڵای لێبێت! ئەی کە چاکە، سوپاس بۆ خوا تۆش درێغیت نەکردووە و سەرکەوتوویت، ئینشائەڵڵا هەردووکتان دەبنە مایەی خێر و بەرەکەت بۆ گەلەکەتان.

---

[1]- بوخاری: ١٢٤٠، موسلیم: ٢١٦٢، ٥

٣- هەر خێزانێك - ئەگەر حەز بكات - دەتوانێت بەشێك لە داهات و مووچەكەی پاشەكەوت بكات بۆ هاوكاریكردنی خێزانی تر، یان كەفالەتكردنی هەتیوێك، یان...

دەكرێت بەردەوام ٢٪ی خەرجیی خێزان پاشەكەوت بكرێت؛ چونكە برە پارەیەكی زۆر كەمە و، هیچ كاریگەرییەك بۆ سەر بار و گوزەرانی هیچ خێزانێك دروست ناكات، هیچ خێزانێك وا نەزانێت كەوا لە قەیراندایە و خەرجی بار و گوزەرانی ژیان زۆری بۆ هێناوە، چونكە چەندین خێزانی دیكە هەن بارگرانییان زۆر لەوان زیاترە، بەتایبەتیش ئەو خێزانانەی دانیشتووی وڵاتە داگیركراو و گەمارۆدراوەكانن و، ئەوانەشی بەدەست شەڕی ناوخۆ و قات و قڕی و نەهامەتییەوە دەناڵێنن.

هەندێك لە خێزانەكان لە مانگێكدا خۆیان لە خەرجیی ڕۆژێك دەگرنەوە، تاوەكو پارەكەی پاشەكەوت بكەن بۆ كەفالەتكردنی بێوەژنێك یان بێباوكێك، هەندێك لە منداڵانیش١٠٪ی خەرجیی مانگانەیان پاشەكەوت دەكەن بۆ كڕینی چەند یاری و بووكەڵەیەك و پێشكەشی منداڵانی خێزانە هەژارەكانیان دەكەن، هەندێ خانەوادەش ئەندامانیان ڕێككەوتوون لەسەر كۆكردنەوەی پارە بۆ هەڵكەندنی بیری ئاو لەو شوێنانەی بەدەست بێ ئاوییەوە گرفتارن... شتانێكی زۆر جوانمان لێرەو لەوێ بەرچاو دەكەون، بەڵام بەداخەوە ئەو خێزانانەی كە بەشدارییان تێدا دەكەن زۆر سنووردارن، بۆیە پێویستە

هەرچیەکمان لەدەست بێت بیگرینەبەر بۆ ئەوەی ئەم کەلتوورە بگشتێنین، پێم خۆشە لێرەدا ئاماژە بۆ شتێکی گرنگ بکەم: ئەویش ئەوەیە: ئەم کارە خێرخوازی و پڕبەرەکەتانەمان سوپاسگوزاریی خوای گەورەیە لەسەر ئەو ناز و نیعمەتانەی بەسەرماندا باراندوونی، لەگەڵ ئەوەشدا زەکاتی لەشساغی و بێوەیی ئەندامەکانی لاشەمانن وەك لەم فەرموودەیەی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت) هاتووە کە دەفەرمووێت: ((على كل مسلم صدقة: قال: أرأيت إنْ لَمْ يَجِدْ؟ قالَ: يَعْمَلُ بِيَدَيه، فَيَنْفَعُ نَفْسَهُ، وَيَتَصَدَّق، قالَ: أرَأيْتَ إنْ لَمْ يَسْتَطِعْ؟ قالَ: يُعينُ ذا الحاجة المَلْهوفِ، أرَأيْتَ إنْ لَمْ يَسْتَطِعْ؟ قال: يَأمُرُ بالمَعْروفِ أو الخَيْرِ، أرَأيْتَ إنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قالَ: يُمْسِكُ عَنِ الشَّرِّ فإنَّها صَدَقَةٌ))[1]. واتە: ((هەموو موسوڵمانێك لەسەریێتی خێرێك بکات، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی ئەگەر نەیبوو چۆن؟ فەرمووی: با قۆڵی لێ هەڵماڵێ و ئیش بکات و هەم خۆی بەخێو بکات و هەم خێریش بکات، وتیان: ئەی ئەگەر ئەمەی بۆ نەکرا؟ فەرمووی: یاریدەی لێقەوماوێکی داماو بدات، وتیان: ئەی ئەگەر ئەمەشی بۆ نەلوا چی بکات؟ فەرمووی: با ڕەفتاری جوان بێت و کاری باش بێت و ڕێگەی باش بە خەڵك بڵێ و واز لە خراپە بهێنێت، ئەمەش دەبێت بە گەورەترین خێر و خێرات بۆی)).

---

١- بوخاری: ١٤٤٥، موسلیم: ١٠٠٨

بانگەشەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ بەشداریکردن لە هەموو کارە چاکەکاندا، بێگومان خوای گەورەش بە باشترین شێوە پاداشتی خاوەنەکانی دەداتەوە.

ئەمە بوو پێم خۆشبوو دەربارەی ڕێڕەو و ئاڕاستەی خێزان پێشکەشی ئێوەی خوێنەری بەڕێزی بکەم، هەوڵمدا بەپێی توانا درێژەی پێنەدەم، داواکارم لە خوای گەورە ئەم کارەم لێ وەربگرێت و، دایکان و باوکانیش سوودی لێوەربگرن.

دوا پەیامیشمان سوپاس و ستایشی پەروەردگاری جیهانیانە



# چەند تیشێك

١. ئومێدی چاکە و چاکخوازی بۆ خۆمان و تەواوی موسوڵمانان بخوازین.

٢. خەسڵەتێکی ڕەفتاری جوان ئەوەیە کە کاریگەریی هۆیەکان و دەرەنجامەکان لەبەرچاو دەگرێت.

٣. دایکی هۆشیار سوورە لەسەر ئەوەی بەر لە نووستن چیرۆکێکی چێژبەخش بۆ منداڵەکانی بگێڕێتەوە یان بخوێنێتەوە.

٤. گرنگە ئەوەمان لەبەر چاو بێت کە پارە و پوولمان هی خوایە و، نابێت لە کاری نابەجێ و ناشەرعیدا خەرجی بکەین.

٥. کار و کاسبی و بازرگانی حەڵاڵ و یاسایی و ڕێگەپێدراو، لەو کارانەن کە سازشیان لەسەر ناکرێت.

٦. ڕێکارێکی باشە خێزان بەشێك لە داهات و مووچەکەی بۆ کاتی تەنگانە پاشەکەوت بکات.

٧. ترۆپکی هۆشیاری لەوەدایە جیاوازی نێوان ڕەوشی ئێستا و ئەوەی بۆی دەکۆشین لەلامان ڕوون بێت.

٨. خوێندنەوەی ژیاننامەی ناودار و کەڵەپیاوان بۆ منداڵەکانمان، دڵگەرمی لە ناخیاندا بەرپا دەکات.

٩. گەر بەتوندی بەرەنگاری بەدڕەفتاریی نەبینەوە، ئەوا بەرەبەرە ڕەفتار و خووڕەوشتە جوانەکانیشمان لەکیس دەچن.

١٠. ئەو خێزانە دەوڵەمەندەی لە خوا ناپارێتەوە، وەك ئەو کۆشکە وایە کە لە دەرەوە ڕووناکە و لە ناویشەوە تاریکە.

١١. لانی کەمی شارەزایی و وەرگرتنی زانیاری، ئەوەیە کە لە ماوەی مانگێکدا کتێبێك بخوێنیتەوە.

١٢. ئەو کەسانەی لە ڕووی ماڵی دونیاوە خۆیان زۆر بە کەسانی دیکە بەراورد دەکەن، هەستی ماددی بەسەریاندا زاڵە.

١٣. چاکەکردن دەرگایەکی بەرفراوانی بەدەستهێنانی خێر و پاداشتی گەورەیە و، هۆکارێکیشە بۆ پاککردنەوەی دەروون و ڕزگارکردنی لە گیانی خۆویستی و خۆپەرستی.

١٤. خۆشویستنی منداڵەکانمان نەکەینە ڕێگر لەبەردەم گەڕان و گەشتکردنیان بۆ دەرەوەی وڵات بە مەبەستی بەدەستهێنانی

زانست و زانیاری و بڕوانامەی بەرز، چونکە سەردەمەکەمان سەردەمی مرۆڤی گەڕۆکە.

١٥. هەمیشە لەیادمان بێت کە ڕۆژی دوایی خانە و لانەی ژیانی ڕاستەقینەیە، تا نەکەوینە داوی مادده و چێژ و خواستەکانی جەستە.

١٦. تەنها خێزانی بەهێز و دڵسۆز دەتوانێت پێداچوونەوە بە کاروبارەکانیدا بکات و، بەشێوەیەکی بەردەوام گۆڕانکاریی بەسەر بار و ڕەوشی ژیانیدا بهێنێت.

١٧. کاتێک پیاو منداڵەکانی بۆ فریودانی هاوسەرەکەی بەکاردەهێنێت، ئەوا بەو کارەی تووشی بەدڕەفتارییان دەکات.

١٨. ڕەوشتی جوان و، ڕەفتاری بەرز و، فێرکردنی باش لە گرنگترین پایەکانی سەرکەوتنن.

١٩. سوودوەرگرتن لە کات یەکێکە لە گرنگترین هەنگاو و تێگەیشتنەکانی مرۆڤی موسوڵمان.

٢٠. ناتوانین بەشدارییەکی کارا بکەین لە خزمەتکردنی کۆمەڵگەدا هەتا بڕوامان بەوە نەبێت کە بەرژەوەندیی خێزانەکەمان هیچی لە بەرژەوەندی کۆمەڵگەکەمان کەمتر نییە.

٢١. خێزانی موسوڵمان شوێنکەوتنی ڕەها و کوێرانەی کۆمەڵگە ڕەتدەکاتەوە، چونکە دەزانێت کە زۆرینەی خەڵکی بەگشتی بەئاگا و تێگەیشتوو نین.

٢٢. گۆڕانكاریی لە ژیانتدا بكە، تاوەكو نەكەویتە داوی بێزارییەوە.

٢٣. بێزاربوون لە ژیان، دوژمنی سەرەكی خۆشبەختییە.

٢٤. پەلەنەكردن لە قسەكردندا و، دەنگبەرزنەكردنەوە و، هاوارنەكردن لە كاتی وتوێژكردندا پێویستە.

٢٥. لە قووڵایی جیاوازی نێوان تاك و كۆمەڵگەوە، نوێبوونەوە لە گشت بوارەكانی ژیاندا هەڵدەقوڵێت.

٢٦. جیاوازی نێوان تاكەكانی خێزان لەسەر هەندێ شت، خاڵێكی ئەرێنییە، بەو مەرجەی جیاوازییەكە سەرنەكێشێت بۆ ناكۆكی و لێكدابڕان.

٢٧. بەدەمەوەبوونی یەكتری شتێكی جوانە، بە مەرجێك سنووری تایبەتمەندییەكانی یەكتری نەبەزێنین.

٢٨. ئەگەر هاتوو كەسی پەروەردەكار كاریگەری و خۆشەویستی خۆی لای منداڵەكان لەدەستدا، ئەوا بەدڵنیاییەوە هیچ سوودێك لە فشار و زۆرلێكردن نابینێت.

٢٩. جیهانیانە بیر بكەرەوە و، خۆجێیانە هەڵسوكەوت بكە.

٣٠. هەرچی دەستكەوت و زیانەكانی ئەم دونیایەن بچووك و كاتین.

٣١. هەمیشە ئەو گێروگرفت و كێشانەی لە ناوخۆی خێزاندا ڕووبەڕوومان دەبنەوە زۆرترن لەوانەی كە لە دەرەوەی خێزانەكە ڕووبەڕوومان دەبنەوە.

٣٢. لــه نیشــانەکانی شــکۆمەندیی هــەر گــەل و نەتەوەیــەک، درێژبوونەوەی وادەی منداڵیی ڕۆڵەکانیەتی.

٣٣. هیــوا و ئاواتــەکانی موســوڵمان زۆر و نــەبڕاوەن، بــەڵام کــە دەستپێدەکات و هەنگاویان بۆ دەنێت، ئەوسا تێدەگات تا چەند توانای بەدیهێنانیانی هەیە.

٣٤. ڕێگە مەدە هیچ ئەندامێکی خێزانەکەت لاپەڕە نەخوازراوەکانی ڕابردووی هەڵبداتەوە.

٣٥. زۆربەی زۆری ئەو هەڵانەی مرۆڤ تێیان دەکەوێت، بەهۆی نیەتی خراپەوە نییە، بەڵکو بەهۆی کەمشارەزاییەوەیە.

٣٦. کاتێـک نـاکۆکی دەکەوێتــە نێوانمانــەوە، بـا هەوڵــەکانمان بـۆ چارەســەرکردنی ئــەو جیــاوازی و ناکۆکییــە لــە بەرژەوەنـدی هاوسەنگی و میانەڕەوییدا بێت.

٣٧. بە هێمنی و بێ خۆهەڵکێشان ئیشوکارەکانت بکە و، دوور بکەوە لەو کەسانەی زۆر بە ئیشوکارەکانی خۆیاندا دەنازن.

٣٨. ئێمە تـەنها بەشێکی ڕاستیەکان دەبینین، داهاتووش نادیارە، لەبەر ئـەوە پێویستمان بـە متمانـە و بڕوابوون و پشتبەستن و پەناگرتن بە خوای گەورە هەیە.

٣٩. دوو شت هەن نابێت لێیان بێزار بین: سوپاسگوزاریی ئەو کەسەی چاکەی لەگەڵدا کردووین و، دەستخۆشیکردن و نرخاندنی ئەو هەنگاوانەی بە نیەتی خێر و چاکەخوازی دەنرێن.

٤٠. سازکردنی کەشێکی ئارام و ئاسوودە بۆ خێزان کارێکی زۆر پێویستە، ئەگەر وا نەکەین، بێزاریی و وەڕسبوون باڵ بەسەر خێزانەکەماندا دەکێشێت.

٤١. ئەو کەسەی دەست بە بیروباوەڕ و بەهاکانییەوە دەگرێت و، خەمی ڕێز و کەرامەتی خۆی دەخوات، ڕەنگە ماوەیەك چەند شتێك لەدەستبدات، بەڵام هەتا هەتایە براوەیە.

٤٢. پێویستە لەسەر خێزانی موسوڵمان ئەو ڕاستییە بزانێت کە ژیانی ڕاستەقینە ژیانی ڕۆژی دواییە.

٤٣. نازپێدانی زۆری منداڵ، هۆکارێکە بۆ ئەوەی زۆرتر خۆی هەڵبکێشێت و زیاتر بەخۆیدا بنازێت.

٤٤. منداڵ کە چاوی بە گریانی باوکی دەکەوێت ترس و تۆقاندن و بێ متمانەیی ڕووی تێدەکات.

٤٥. دەستپێکی بەلاڕێداچوونی منداڵ بەزۆریی دەگەڕێتەوە بۆ هاوڕێیەتیکردنی لەگەڵ منداڵێکی بەدڕەوشت و بەلاڕێداچوو.

٤٦. زیادەڕۆییکردن لە ئامۆژگاریکردنی منداڵان، سەنگ و کاریگەری پرۆسەکە لە دڵ و دەروونیاندا کەم دەکاتەوە.

٤٧. زۆرترین خۆشبەختی و ئاسوودەیی ئێمە بەندە بە خزمەتکردنی زیاتری خەڵکەوە.

٤٨. جێی خۆیەتی نهێنییەکانی خێزان بپارێزین، بەمەرجێك نەگاتە ئاستی ئەوەی توندگیر بین و هەموو شتێکی ناو خێزانەکەمان بە نهێنی بزانین.

٤٩. ئەگەر هەنگاو نەنێین بۆ پێشەوە و هەوڵی سەرکەوتن نەدەین، مانای وایە هێشتا هەر بەتەواوەتی لە دینداریی ڕاستەقینە نەگەیشتووین.

٥٠. تا زیاتر شارەزابین، دڵ و دەروونمان بۆ وەرگرتنی ڕەخنە فراوانتر دەبێت.

٥١. لۆمەکردنی خەڵکی ئاسانە، بەڵام بێسوودە، ئەوەی زۆر گرنگ بێت ئەوەیە چارەسەر بۆ کێشەکان بدۆزینەوە.

٥٢. مرۆڤ تا نەدوێت، ناناسرێت.

٥٣. لە سیفەتەکانی مرۆڤی ڕەوشتبەرز و خەمخۆر ئەوەیە لە پاشملە نزا بۆ خوشك و برایان و دۆستانی بکات.

٥٤. ڕەنگە مرۆڤ نەتوانێت بەردەوام بەدەم خەڵکەوە بێت، بەڵام خۆ دەتوانێت لە بەسەرکردنەوەکانیدا هاوسۆزی و هاوخەمیی خۆی دەرببڕێت بۆیان.

٥٥. بەراوردکردنی زۆری خوشك و براکان بە یەکتری، دەبێتە مایەی لەخۆباییبوونی بەشێکیان و، دڵشکان و بێمتمانەیی بەشێکی تریان.

٥٦. کەسی گەشبین دەڵێت: ئەوە کێڵگەیەکی گوڵ و گوڵزارە و، کەمێك دڕك و داڵی تێدا بەدیدەکرێت.

٥٧. کەسی ڕەشبینیش دەڵێت: ئەوە کێڵگەیەکی دڕك و داڵە و، کەمێك گوڵ و گوڵزاری تێدا بەدیدەکرێت.

٥٨. لوتکەی سەرکەوتنی دایك لە پەروەردەکردندا ئەوەیە کە وەك هاوڕێیەکی خۆشەویست و لێکدانەبڕاو مامەڵە لەگەڵ کچەکەیدا بکات.

٥٩. پێکەوەژیان و بەدەمەوەبوونی یەکتریی ئەندامانی خێزان بنچینەی خێزانی بەختەوەرە.

٦٠. ئەگەر تێچووی خوێندن و فێربوون و زانینت بەلاوە زۆرە، ئەوا نەزانی تاقی بکەرەوە.

٦١. ناتوانین سەرکردایەتی خەڵکی بکەین، تا لە پێداویستییەکانیان نەگەین.

٦٢. ڕێنمایی و گفتوگۆکانی خێزان هیچ سوودێکیان نابێت، ئەگەر تەواوی تاکەکانی خێزان پێیان ئاسوودە نەبن.

٦٣. ئەگەر لە سەر ئێشەی پرۆسەی پەروەردە بێزار بوویت، ئەوا بزانە ئەو ئەرکەی لەسەر شانی تۆیە بەرامبەر بە منداڵەکانت، پێشتر ئەرکی سەرشانی دایك و باوکت بووە بەرامبەر بە تۆ.

٦٤. هیچ شتێك وەك داوای لێبوردنكردن ناتوانێت دەری بخات تا چ ڕادەیەك توانای دەستپێشخەریكردن و متمانەبەخۆبوونمان تێدایە.

٦٥. ناتوانین چارەسەری كێشەكانمان بكەین، گەر بێتو ئەو بەڵێنانە نەبەینەسەر كە داومانن.

٦٦. هیچ هاوسەرگیرییەك سەرناگرێت، ئەگەر پێشوەخت پێمان وانەبێت كە ئەو پرۆسەیە دوو ڕۆحی ئاوێتە بەیەكتری كردووە.

٦٧. لە جیهاندا ئەمڕۆ شۆڕشێكی گەورە بەرپا بووە بۆ ڕازیكردنی هەوەس و ئارەزووەكان، ئەگەرچیش باجەكەی ئایین و چاكەخوازی بێت، بۆیە پێویستە بە وریاییەوە مامەڵە بكەین.

٦٨. بەردەوام دەرفەتی كار باشتر لەبەر دەستدا هەڵدەكەوێت.

٦٩. ڕێگەخۆشكردن بۆ منداڵ تا ئازادانە پرسیارەكانی بكات، هەستی ئەوەی لا گەڵاڵە دەكات كەوا لە خێزانێكدایە ڕێز لە بۆچوون و تابەتمەندییەكانی دەگیرێت.

٧٠. لە هەر خێزانێكدا، گەر تاكەكان كاروبارەكانی خۆیان و خێزانەكەشیان لەبەرچاو بگرن، ئەوا بزانە ئەو خێزانە یەكگرتوو و بەختەوەرە.

٧١. پێویستە پیاو هاوسەرەكەی بەلاوە گرنگتر بێت لە منداڵەكانی و، ئەو گرنگیپێدانە لە هەڵسوكەوتەكانیدا ڕەنگبداتەوە.

٧٢. پیاو و ئافرەتی مەرد، ئەو کەسەیە کە لە کاتی زیانپێگەیاندندا خەڵکێکی زۆر داخ و حەسرەتی بۆ دەخۆن.

٧٣. کاتێك ڕاستگۆیانە مامەڵە لەگەڵ خۆماندا دەکەین، واتە خەریکین لەسەر ڕێگەی ڕاست هەنگاو هەڵدەگرین.

٧٤. تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت و فەیسبووك شادییە کۆمەڵایەتییەکانی تێکداوین، وا بڕوات فراوانبوونی هۆیەکانی خۆشگوزەرانی شیرازەی خێزانەکانمان تێکدەدات، ئەمەش پێویستی بە هەڵوێستەلەسەرکردنە.

٧٥. بیر و ویژدانی منداڵ گەشە ناکات، ئەگەر بێتو تا ڕاددەیەك سەربەستیی بۆ فەراهەم نەهێنیت و، دەرفەتی ئەوەی بۆ نەڕەخسێنیت کە بەدڵی خۆی ئەوەی پێی خۆشە ئەنجامی بدات.

٧٦. گەر یەکبگرین وەکو جوتیار و باخەوانەکانمان لێدێت، ئەها ئەوان کاتێك پێکەوە کارێك دەکەن دەستکەوتێکی هێندە مەزن بەدەستدەهێنن کە کەس بەتەنها ناتوانێت بەدەستی بهێنێت.

٧٧. لە نیشانەکانی خێزانە بەختەوەر و سەرکەوتووەکان کەمکردنەوەی هەر یەك لە سکاڵاکاریی و کێبڕکێکردن و ڕەخنەگرتن و بەراوردکارییە.

٧٨. ژیان فێری کردوین پەیمانداری و پابەندبوون بە بیروباوەڕەوە، هەستی بەرپرسیارێتیت لە لا دروستدەکات.

٧٩. با منداڵ لەسەر پێشبینی کاردانەوەکانی ئێمە بۆ ڕەفتارەکانی ڕابهێنین، تاوەکو هەست بە گرنگی دەسەڵات و لێپرسینەوە لە ژیانیدا بکات.

٨٠. ئەرکی ئێمە بەرامبەر بە منداڵەکانمان لە بەرپرسیارێتییەوە دەستپێدەکات، پاشان بە ڕێنمایی و ئاڕاستەکردندا تێدەپەڕێت و دواتر بە سەرنج و تێبینی کۆتایی پێدێت، دواتر پێویستە هێدی هێدی لە دەستوەردان لە ژیانی منداڵەکانمان پاشەکشە بکەین.

٨١. هەر شتێك لە سنووری خۆی تێپەڕی کرد، دەبێتە شتێکی زیانبەخش.. بەهەمان شێوە ئەگەر زیاد لەپێویست بە شان و باڵی منداڵدا هەڵبدەین وەکو ئەو کەسەمان لێدێت کە هەر هیچ ستایش و دەستخۆشییەکی نەکردبێت.

٨٢. چاوپۆشیکردن لە هەڵەی بچووکی منداڵەکانمان، ڕەنگە تووشی هەڵە و تاوانی گەورەیان بکات.

٨٣. شێوازی گفتوگۆکردن لە پەروەردەکردنی منداڵاندا، دەبێتە مایەی بەهێزکردنی هەستی بڕوابەخۆبوون و ڕێز لەیەکترگرتن.

٨٤. هەر هەوڵ و هەنگاوێکی خێر و چاکەکاریی شیاوی دەستخۆشیلێکردنە، بەبێ گوێدانە دەرەنجامەکان.

٨٥. ئێمە لە مەیدانی جەنگێکی بەهێزی نێوان چاکە و خراپەداین، بێگومان سەرکەوتنیش پێویستی بە بێدارییەکی بەردەوام هەیە.

٨٦.زۆربەی زۆری کێشە و گیروگرفتەکانی نەتەوە و خێزان و تاکەکان ناوخۆیین و، پەیوەندییان بە هەڵە و کەموکورتی خۆیان و خەڵکییەوە هەیە.

٨٧.ڕێزلەخۆگرتن شتێك نییە کە بدرێت، بەڵکو لە میانی کار و ڕەنجی خەمخۆرانە و بەردەوامەوە بەدەستدێت.

٨٨.کێشەی زۆرینەی خەڵکی لەگەڵ ئەو شتانەدایە کە دەکرێن، نەوەك ئەو شتانەی کردنیان ئەستەمە، واتە لەگەڵ ئەو شتانەدایە کە ئاسانن، نەوەك ئەو شتانەی سەختن.

٨٩. مرۆڤ چەند زیاتر هەست بە بەرپرسیارێتی بکات، ئەوەندە زیاتر نزیك دەبێتەوە لە کامڵبوون و پێگەیشتوویی.



# پێڕست




# مسار الأسرة

## مبادئ لتوجيه الأسرة

ئەمڕۆ لەسەر ئاستی خێزان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان سەرمان لێشێواوە و، نازانین چۆن چۆنی مامەڵە لەگەڵ لێشاوی ئەو کەلتوور و فەرهەنگە بیانیانەدا بکەین کە لە هەموو لایەکەوە بەسەرماندا باریون، بەوەشەوە نەوەستاوە کار گەیشتووەتە ئەوەی کە دابەشبوونی کۆمەڵایەتی لێبکەوێتەوە و، زۆرێك لەو داب و نەریتانەی کە جێگەی ڕێز و لەبەرچاوگرتن بوون تێڕوانینی جیاوازیان تێبکەوێت.

ئەم پەرتووکە تەرخانکراوە بۆ قسەکردن لەسەر چەند بنەما و چەمکێك کە نەخشەڕێگای خێزانی موسوڵمانمان بۆ دەکێشن و بە چەندین دیدگا و ڕەوشت و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی جوان ئاشنای دەکەن، بەرچاوڕوونی مرۆڤ دەربارەی ئاڕاستە و ڕێڕەوی ژیانی یەکێکە لە هەرەگرنکترین خاڵەکانی دامەزراوی و بەختەوەری ژیانی خێزانداری، هەروەها گرنگیی تایبەتی هەیە لە دەستنیشانکردنی ئەو شێواز و ڕێگایانەی کە لەسەر دایك و باوکەکان پێویستە بیگرنەبەر لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیاندا.

0-0237-0000-9


ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا